گۆڤارێکی رۆشنبیری مانگانەی گشتی یە

ساڵی دووەم * تشرینی دووەمی ١٩٩٣ * جەمادی دووەم ١٤١٤

لە یادی

١د

## لەم ژمارەیەدا

### لێکۆڵینەوە



### پەیامی کۆمەڵایەتی



### پەیامی ئەدەبی و هونەری



### پەیامی زانستی

# پەیامی ڕاست

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەی گشتی یە

کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامیی کوردستان

دەری دەکات

ناونیشان : پۆستەی سلێمانی

ص . پ (١٠٦)

خاوەنی ئیمتیاز
عثمان حمه امین
(جوتیار)

سەرنووسەر
هادی علی

بەڕێوەبەری نووسین
عمر عبد العزیز


جورئەت

هەر ڕۆژنامە و گۆڤار و بلاوکراوەیەک پاش تێپەڕبوونی ماوەیەک بەسەر لە ئەزموون دەرچوون و سەرکەوتنیدا جەماوەر و لایەنگر و دۆست و هاریکارانێک بۆ خۆی پەیدا دەکات لە ڕووی ئەوەوە سەنگ و سووکیی بڕوای خەڵک و ئاوێنە بوونی دەخەملێنێ لەوانەشە زۆرجار لە ئاوێنە بوونیدا موبالەغەی بێ جێگە بکرێت، وە بۆ زیاتر چوونە پێش لەم دروستکردنی لایەنگر و ڕەنگدانەوەی ڕای خەڵکە تا چەند ئوسلوب و ڕێگای جۆربەجۆر بگیرێتە بەر لەوانە جورئەت بەخەرج دان..

ئێمە لەم ماوەی خزمەتەماندا بەقەدەر هاوکار و دۆست و لایەنگر ئەوەندەی گۆڤارەکە جێگەی خۆی لە دڵی خەڵکدا کردۆتەوە خۆمان بە خاوەنی جەماوەر دەزانین و ئاوێنەی ئەوانین.. بۆیە هەمیشە جورئەتمان بەقەدەر خۆناسینمانەوە، ئەوەمان لە بیرناچی کە لە نێوان جورئەت و بریندار کردنی شعووری کەس و لایەنی تردا و لە نێوان جورئەت و تێکەڵبوونی مەلەفدا و لە نێوان جورئەت و هەلوێستی مەسئولانەو هەست بە لێپرساوی کردندا پەردەیەکی ناسکێ هەیە.. زۆر کەمن ئەوکەسانەی کە ئەو پەردە ناسکەیان لێ نەشێوێ و، جورئەت وەکێ جورئەت ببینن و شتەکانی تریش لە شوێنی خۆیدا دابنێن .

سه روتار

ئـــازادیـی بـیروبـاوه ڕ یه که مین مافه که مرۆڤ به هۆیـــه وه بتوانێت وه کۆ دروستکراوێکی به ڕێزی په روه ردگار ژیان به سه ربه رێت و ئه رکه کانی سه رشانی جێبه جێ بکات و ، ئه و مه به سته پیرۆزه ی لێـی چاوه ڕوان ده کرێت به تێر و ته واوی به ئه نجامی بگه یه نێت ..

بۆیه ئه و مرۆڤه ی ئه م ئازادی یه ی لێ زه وت بکرێت وه کۆ ئه وه وایه که هه ر له سه ره تاوه ئینسانیه تی لێ سه نرابێته وه .. ئه وکاته به هیچ شێوه یه کۆ ناتوانێت وه کۆ مرۆڤێکی ئاسایی به شێوه یه کـــی گونجاو ڕۆڵی پێ سپێردراوی له سه ر شانۆی ئه م ژیانه به جێ بهێنیت ..

بێگومان له گه ڵ ئازادیـــــی وه رگرتنی بیروباوه ڕدا ، ده بـــێت ئازادیی بلاوکردنه وه و بانگه شه بـۆ-ـکردنیشی له سنووری په سه ندکراودا دابینکراو بێت و ، له هه موو سزا و تۆڵه یه کۆ له و پێناوه دا پارێـــزراو بێت و،هیچ که سێکۆ مافی ئـــه وه ی نه بێ ڕێگای لێ بگرێت و هه ڵوێستـــی دژواری له به رانبـه ره وه بنوێنێت .. ئه گه ر وا نه بێت ، ئه وا ئازادی یه کی بێ ناوه ڕۆکه و له واقیعی ژیانـــدا هیچ کاریگه ری یه کی ئیجابیی نابێت .

ئیسلام که پێشکه وتووترین و ڕاستترین بۆچوونه بۆ ژیـــان و

لە هەمان کاتدا چاکترین بەرنامەی ژیانە بۆ کۆمەڵگەی ئینسانی .. چواردە سەدە لەمەوبەر بەڕوونی ئەم ڕاستییەی ڕاگەیاندووە و، داوا لە بانگخوازانی ڕێگای خوا دەکات کە هیچ شێواز و ڕێگایەکی ناچارکردن بەکار نەهێنن بۆ وەرگرتن و قبوڵکردنی بیروباوەڕی بەکتاپەرستی لەلایەن مرۆڤەکانەوە. ((لا اكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي .. )) / البقرة - ٢٥٦ .

مەسەلەی وەرگرتنی بیروباوەڕ - لە ئیسلامدا - مەسەلەی قەناعەت و پەسەندکردنی ژیریە، پاش ڕوونکردنەوە و ئیکردنەوەی بنەماکانی بەبەڵگەی ڕاست و دروست ..

لە ڕاستیدا ئیسلام بیرو ژیریی مرۆڤ دەدوێنێت .. لەگەڵ دڵ و ویژدان و ناخی دەروونیدا دەدوێت.. بەبێئەوەی پەنا بباتە بەر هیچ جۆرە ڕووداوێکی ماددی لەسروشت بەدەر و ئەفسانەیی ، کە بینەرانی ناچار بکات بە وەرگرتنی بیروباوەڕەکەی ، بێئەوەی عەقڵ و هۆشیان لێی تێبگات و پەسەندی بکات .. هەر بۆیە بڕیار دراوە قورئانی پیرۆز پەیام و موعجیزەی هەتا هەتایی مرۆڤ بێت، چونکە قورئان موعجیزەیەکی فیکری و زانستییانەیە و ، (اعتماد)ی لەسەر ڕوونکردنەوە و توێژینەوە و (حیوار) و قەناعەت پێکردنە ..

گومان لەوەدا نییە کاتێک ئیسلام پشت بە ڕووداوی ماددیی لەسروشت بەدەر نەبەستێت بۆ گەیاندنی پەیامەکەی ، ئەوا هەرگیز پەنا ناباتە بەر بەکارهێنانی زەبر و زەنگ بۆ سەپاندنی بیروباوەڕەکەی لەژێر کاریگەریی هەڕەشە و ناچارکردندا ..

ئیسلام بەرنامەی خوایە بۆ مرۆڤ .. ئەو خوایەی کە مرۆڤ و بوونەوەریشی دروستکردووە .. شارەزایی و ئاگاداریی تەواوی بە دروستکراوی خۆی هەیە .. ((ألا يعلم من خلق وهو اللطيف الخبير)) / المُلكُ - ١٤

بۆیە ئەوبەڕی ڕێزی لێناوە .. ئەویش پێبەخشینی ئازادیی بیروباوەڕە ..

خوای پەروەردگار مرۆڤی

ناچار نه‌کردووه که ته‌نها ئه‌و بیه رستێ .. به‌ڵکو ئازادی واختیاری داوه‌تێ بۆ ئه‌وه‌ی به ژیری و تێگه یشتنی خۆی به‌ندایه‌تیی به دیهێنه‌ری مه‌زن بکات ، چونکه خوا خۆی ده‌زانێت ئه‌گه‌ر بواری ته‌واو به مرۆڤ بدرێت ده‌توانێت به قه‌ناعه‌ت و ئاره‌زوومه‌ندیی بیروباوه‌ڕی شیاو هه‌ڵبژێرێت .. (( إنّا هديناه السبيل إمّا شاكراً وإمّا كفوراً )) / الدهر - ٣ ..

له لایه‌کی تره‌وه . به‌جێهێنانی ته‌کالیفی شه‌رعی و دیاری کردنی پاداشت و سزا له ڕۆژی دواییدا له سه‌ر بنچینه‌ی ئازادی و سه‌ربه‌ستی‌یه ، ئه‌گینا پێچه‌وانه‌ی داد و عه‌داله‌تی‌خوایی ده‌بێت ..

له‌جێیه‌کێ خوای په‌روه‌ردگار که به دیهێنه‌ری هه‌موانه ، مرۆڤه‌کانی ناچار نه‌کردبێ بۆئه‌وه‌ی به‌ندایه‌تیی ئه‌و بکه‌ن ، بێگومان هیچ لایه‌ن و ده‌سه‌لاتێکی‌تر مافی ئه‌وه‌ی نی‌یه ئه‌م ئازادی‌یه‌ی لێ‌زه‌وت بکات و ، بیروباوه‌ڕ و بۆچوونێکی تری به‌سه‌ردا بسه‌پێنێت .

ڕووداوه‌کانی مێژووی دوور و نزیکێ ئه‌و ڕاستی‌یه ده‌سه‌لمێنن که هه‌رگیز نه‌توانراوه بیروباوه‌ڕ به زۆره‌ملێ به‌سه‌ر مرۆڤه‌کاندا بسه‌پێنرێت .. له هه‌ر قۆناغێکێ و له هه‌ر شوێنێکیشدا هه‌وڵێکی له‌و بابه‌ته درابێت ، بێ‌ئه‌نجام بووه و زۆری نه‌خایاندووه دام و ده‌زگای سته‌مکاری‌یان هه‌ره‌سی‌هێناوه ..

بیروباوه‌ڕی ڕاست و دروست پێویستی به توندو تیژی و زۆره‌ملی و سه‌پاندن نی‌یه ، به‌ڵکو پێویستی به هه‌وایه‌کی‌ئازاد و بارودۆخێکی ئارام و کراوه‌یه ، بۆ ئه‌وه‌ی ڕواڵه‌تی‌جوان و ڕازاوه‌ی بۆ هه‌موو لایه‌کێ ده‌رکه‌وێت و هه‌رکه‌سێکێ به ئاره‌زوومه‌ندیی خۆی به‌پیریه‌وه بچێت .

خاوه‌ن بیروباوه‌ڕی ڕاست و دروست هیچ ترسێکی له ئازادیی بیروباوه‌ڕ نابێ‌و هه‌میشه شه‌یدای شنه‌بای ئازادی و سه‌ربه‌ستی‌یه ، چونکه دڵنیایه (ڕاستی)بنه‌ڕه‌تی ( وجود ) ه و ، هه‌ر ده‌مێنێته‌وه .. به‌ڵام بیروباوه‌ڕی ناڕاست و ناته‌واو هه‌رچه‌نده هه‌راو زایه‌ڵه‌ی به‌رزبێته‌وه ، سه‌ره‌نجامی

پووکانه وه و له ناوچوونه ئه مـــه ش یاسایابه کی خوایی یه لـــــــه م بوونه وه ره دا : (( فأمّـا الـزّبـــد فیذهب جفـاءً ، وأمّا ما ینفـــع الناس فیمکث فی‌الارض ))/١٧ الرعد.

ئه مرۆ له کوردستانی ئـازاد دا دوای سالّه ها ژیانی چه رمه ســه ری و پڕ ئێش و ئازاری ژێر ڕکێفـــــی سته مکاران و دوژمنانی خوا .. لـــه ئه نجامی ئه و گۆڕانکاری یه ی که له سیستمی نێوده ولّه تیدا ڕوویـــدا هاوکات له گه ڵ هه لـــــه زه ق و ناشیگه ری یه کانی دیکتاتـــۆری به غـدا دا ، بارودۆخێکی نوێ بـــۆ کوردستان هاته کایه وه و، هـــه وری ڕه ش و تاریکیی سته م ڕه وی یه وه و ، شنه بای ئازادی و سه رفرازی به سه ر میلله تی چه وساوه ماندا هه لّـــی کـردووه .. ئێمه ی هه لّگرانــــی بیروباوه ڕی ئیسلامی و خواناســـی وه کو به شێکی بنه ڕه تی و دلّســۆزی ئه م گه له موسلّمانه وه ک هه مـــوو توێژو لایه نه دلّسۆزه کانـی ئــــه م گه لــه پڕ به دلّ پێشوازیمان لـــه م ئازادی یه کرد وه و ، خۆمان بـــــه به رپرسیار ده زانین به رانبــــه ر پاراستـــن و به رده وام بوونی .. وه وا ده زانین نه ک هه ر مه ترسی یه ک له گه شه کردن و ژیانه وه ی گیانـــی ئیسلامـیتی وخواناسیـی دا نی یـه بـــــۆ ئێستا و ئاینده ی گه له که مان به لّـــکو هه ر هه مـــووی مایـه ی خێر و سه رفـــرازی و سه ربه رزی یـه بـــۆ هه ردوو جیـــهانـمان ..

ده سته ی نووســــه ران

عمر علی غفور

له‌م سه‌رده‌مه‌دا مۆته‌كه‌ی بیروبۆچوونێكی بێ به‌ڵگه‌ و دوور له‌ راستی سه‌رشانی زۆرێك له‌ و رۆشنبیرانه‌ی گرتۆته‌وه‌ كه‌ شاره‌زایی و ئاگاداری یان له‌ئیسلام سفره‌و، ئه‌یدا و كه‌ مه‌ندكێشی شارستانیی رۆژئاوان .. ئه‌ویش ئه‌وه‌یه‌ كه‌ هه‌ر كاتێ ناوی (( ئیسلام )) یان به‌ر گوێ ده‌كه‌وێت یه‌كسه‌ر دیمه‌نی ده‌یناسۆرێكی زه‌به‌لاحیان دێته‌ پێش چاو كه‌ ـ ئه‌لم كوێرم، نابوێرم ـ گشت رۆاڵه‌ته‌كانی شارستانیی پێشێل ده‌كات و، كۆرپه‌ی زانست و ته‌كنۆلۆجیا له‌بار ده‌بات و، چرۆی پێشكه‌وتن و بووژانه‌وه‌ جوانه‌مه‌رگ ده‌كات .. به‌مانایه‌كی روونتر ئیسلام به‌له‌مپه‌ر و كۆسپی رێگای پێشكه‌وتن و زانست و شارستانی ده‌زانن و ،هۆی دواكه‌وتنی گه‌لانی موسڵمانیش هه‌ر بۆ شوێنكه‌وته‌یی ئه‌و ده‌گێڕنه‌وه‌ .. بۆیه‌ له‌ فه‌رهه‌نگی بیروهۆش و زمانیاندا (ئیسلام) و (دواكه‌وتن) دوو وشه‌ی هاومانان .. ئه‌ڵبه‌ت به‌م پێیه‌ تۆمه‌تی (كۆنه‌په‌رستی) و (دواكه‌وتوویی) ش كاڵای باڵای ئه‌وانه‌ ده‌بێ كه‌ بانگه‌واز بۆ ئیسلام ده‌كه‌ن ..

خۆ ئه‌گه‌ر لاپه‌ره‌كانی رۆژگار هه‌ڵده‌ینه‌وه‌ و به‌شوێن سه‌ره‌تای له‌دایكبوونی ئه‌م بیروبۆچوونه‌گه‌نده‌ڵه‌دا بگه‌ڕێین، ده‌بینین له‌و كاته‌وه‌ ده‌ستی پێ- كردووه‌ كه‌ شاڵاوی ئیمپریالیزمی

ڕۆژئاوا بە خۆی و ڕواڵەتی شارستانی-
-یەوە باڵی ڕەشی بەسەر جیهانی
ئیسلامیدا کێشا .. لەو کاتەشدا
جیهانی ئیسلامی لە حاڵەتێکی
سڕیی و مەییویدا دەژیا. گشت
چالاکییەکانی شارستانێتی لە پلەی
سفردا بوون، ئەڵبەت ئەمیش هۆی
مێژوویی خۆی هەبوو کە بەدرێژی
باسکردنی دەرفەتێکی زۆری دەوێ -
تەنها ئەوەندە بەسە ئاماژە ی بۆ
بکەین کە هێرشی مەغۆل و تەتار و
خاچپەرستەکان و، ناکوکییە
ناوخۆییەکان و هۆیانە بوون کە
بوونە مایەی لە ناوچوونی ئەو
کە لە پوورە زیاریەی کە
موسڵمانان لە ماوەی حەوت سەدەی
یەکەمی یەکەمی ئیسلامدا بنیاتیان
نابوو.. وە هەموو ئەمانە بیری
پێشکەوتن و شارستانێتییان لە بیری
موسڵمانان بردەوە .. ئەم حاڵەتەش
درێژەی کێشا تا دوای چەند سەدەیەک
موسڵمانان هیچ ڕواڵەتێکی
شارستانیتییان پێوە نەماو، بوونە
یەکێ لە دواکەوتووترین نەتەوەکانی
سەر زەوی .

بەڵێ، هەرچەندە دوای
ڕووخانی دەلافەتی عەباسی لە
ساڵی ١٢٥٨ ز داو، وردە وردە پەر-
-تەوازە بوون و لە ناوچوونی
کە لە پووری زانستی و کەلتووری و
تەکنیکیی موسڵمانان و ... وەچە
نوێیەکان ئەو تێکە یشتنە چرو پڕو
هەمەلایەنەیان لە ئیسلام نەما
کە باب وباپیرانیان هەیانبوو..
ئەمەش زیاتر گۆمی دواکەوتوویی-
-یەکەی قووڵتر کرد . لەگەڵ
ئەمانەشدا ، ئیسلام هێشتا وەک
هێزێکی کاریگەر تین و تەوژمی
لە سەر دڵ و دەروونیان مابوو و،
پاڵی پێوە دەنان بۆ ڕاپەڕین دژ بە
ستەمکاران .. بۆیە کاتێ وڵاتانی
ئیمپریالیزمیی دەستیان کێشا بە
سەر زۆرێک لە وڵاتانی ئیسلامیدا،
تەنها هێزێک کە دنەی
موسڵمانانی دەداو، هێزی یەک-
-دەخستن و هەستی ڕاپەڕین دژ بە
داگیرکەرانی تێدا دەورووژاند ن
ئیسلام بوو ..

بەم پێیە ئیسلام بووبووە
ئەو خۆرەی کە داگیرکەرانی وەک
شەمشەمەکوێرە دەپێچایەکون و
قوژبنی تەنگ و تاریک و جێگای

پێ‌لەق دەکردن و خەوی لێ تاڵ دەکردن .. بۆیە کە وتنە پلان دانان بۆ ڕیشەکەن کردنی ئەو ئیسلامە لە دڵ و دەروون و کۆمەڵگای موسڵماناندا .

جا یەکێ لەو دەروازانەی کە لێیەوە تیری ژەهراویی خۆیانیان گرتە قەڵای پتەوی موسڵمانان ، ئەو دواکەوتوویی بەیان بوو.. هاتن قۆستیانەوە و ، وایاندا بەگوێی موسڵماناندا کە هۆی ئەم دواکەوتنەتان ئەم ئیسلامەیە کە ئێوە ئەوەندە توند گرتووتانەو بەری نادەن .. ئەوەتا ئێمە چونکە وازمان لە ئایینی باب و باپیرانمان هێنا ، بەم شێوە بە پێشکەوتووین کە دەمانبینن .. ئەگەر ئێوەش واز لە ئیسلام بێنن - کە مایەی دواکەوتنتانە - وەکو ئێمە پێش دەکەون ..

ئەم تیرە ژەهراوییەش بە هۆی بێ ئاگایی موسڵمانانەوە لە حەقیقەتی ئیسلام کارێکی خراپی تێکردن و ، وردە وردە بیروبۆچوون و نێروانینیانی - بەتایبەت ئەوانەیان کە بۆ خوێندن دەچوونە ئەورووپا - سەبارەت بە ئیسلام گۆڕی .. ئەمەش لەگەڵ ڕۆژگاردا زیاتر تەشەنەی کرد ، تا سەرەنجام وەچەیەکی پێگەیشت کە ئەم بیروبۆچوونە وەکو ڕاستییەکی گومان هەڵنەگر لە بیرو هۆشیاندا چەسپا ..

کە واتە ، تۆمەتی (دواکەوتوویی) دانە پاڵ ئیسلام تۆمەتیکە بە ناڕەوا داگیرکەران بۆ بێزاندنی ئیسلام دروستیان کردووە ، نەک ڕاستییەک بێت و لە لێکۆڵینەیەکی بابەتیی بێ لەکەوە سەرچاوەی گرتبی ..

جا ئێستە با بزانین ئاخۆ ئیسلام هۆی دواکەوتنی موسڵمانان بووە ؟! ئایا ڕاستە ئیسلام دژ بە زانست و پێشکەوتنە ؟! وە ئایا ئەگەر موسڵمانانی ئەمڕۆ ئیسلام بکەنەوە بە بەرنامەی ژیانیان لە کاروانی پێشکەوتن و شارستانیتیی سەردەم دوا دەکەون ، یان نا ؟!

بۆ زانینی هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بە پێشکەوتن و زانست و شارستانیتی پێویستە سەرەتا هەڵوێستی (نظري) لە دەقە چەسپاوەکانیەوە وەربگرین ، کە

سەرچاوەی لێ هەڵێنجانی بۆچوون و هەڵسوکەوتی موسڵمانانن، ئنجا چاو بەو واقیعەدا بگێرین کە ئیسلام بۆ موسڵمانانی ـ لە درێژایی مێژوودا ـ هێناوەتە دی، تا رادەی واقیعێتیی فەرمانەکانی ئەو دەقە چەسپاوانە بزانین، کە ئەم دوو سەرچاوەیەمان بەسەر کردەوە ئەوکاتە بە ئاسانی هەڵوێستی ئیسلاممان دەستگیر دەبێ.

ئەڵبەت لەم لێکۆڵینەوەوە کورتەدا دەرفەتی شیکردنەوەی گشت لایەنەکانی ئەم مەسەلەیە نییە، ئەوەندە دەتوانین کلیلی گەنجینەکە بدەینە دەست ئەو کەسەی کە عەودالی ڕاستییە.. لەوە بەدوا خۆی ـ ئەگەر بەڕاستی هەقدۆست بێ ـ دەتوانێت لە سەرچاوە تایبەتییەکانەوە خۆی زیاتر بەهرەمەند بکات.

ئەگەر سەیرێکی قورئانی پیرۆز بکەین، دەبینین پڕەلە و ئایەتانەی کە هانی موسڵمانان دەدەن بۆ خوێندن و فێربوون و بیرکردنەوە و قارکردن و نەسرەوتن و .. هتد کە ئەمانەش هەوێنی پێشکەوتن و شارستانێتین. ئەوەتە یەکەم وشە لە قورئاندا کە دابەزیوەتە سەر زەوی،کە یەکەم فەرمانیشە ئاراستەی هەڵگرانی بکات وشەی (اقرأ ـ بخوێنە) یە، کە فرمانی داخوازییە .. ـ ـ یر دەکەین پێش ئەوەی فەرما بە نوێژو ڕۆژوو و ذیکر و .. هتد بکات، فەرمان بە خوێندن دەکات..

یەکەمین کۆمەڵە ئایەت دەفەرموێ: (( اقرأ باسم ربّكَ الذي خلق . خلق الانسان من علق . اقرأ و ربّكَ ا ـكرم الذي علّم بالقلم علّم الانسان ما لم يعلم )) ..

سەرنج دەدەین لەم چەند ئایەتە کورتەدا دوو جار وشەی (اقرأ) دووبارە بوەتەوە، هەروەها سێ جار وشەی (علم) دووبارە بوەتەوە، وشەی (قلم) یش جارێک.. جا بێهودە نییە یەکەم کۆپلە ئایەتی قورئان بە وشەکانی (اقرأ ، علم، قلم) ڕازێنراوەتەوە.. ! بێگومان دووبارە و سێبارە کردنەوەی هەر شتێکیش گرنگیی و بایەخداریی ئەو شتە دەردەخات لای داواکارەکە.. کە واتە ئەمانە بەزمانی حال

هاوار بۆ خوێندن قەڵەم دۆستی و زانست پەروەریی دەکەن..

بەرنامەیەکێ کە یەکەم فەرمانی ئاراستەی شوێنکەوتووانی بکات و، بیکاتە بەردی بناغەی بەرنامەکەی ئەوە بێت کە بخوێنن و، چەند جار دووپاتی بکاتەوە و، باسی گەورەیی و رێزی قەڵەم وزانستیان بۆ بکات و سوێندیان پێ بخوات: ((ن. والقلم وما يسطرون))، ئەمەش لە سەردەمێکدا کە خوێندەواری لە ئاستێکی زۆر لاواز و بێ‌دەرەتاندا بووە، کەی رەوایە تۆمەتی کۆنەپەرستی و تلیاکی و دوگماتیزمی و،.. هتد بدرێتە پاڵ؟

قورئان کە فەرمان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەکات کە بخوێنێ، ئەمە ئامارەیە بۆ نەخوێندەوارانی ئوممەتەکەی کە بخوێنن و خۆیان لەو مۆتەکەیە رزگار بکەن.. ئامارەیشە بۆ خوێندەواران کە زیاتر لە خزمەتی قەڵەم و خوێندن و زانستدا بن تا زیاتر ئاسۆی بیریان فراوان بێت و بتوانن گرێ کوێرەکانی ژیان بۆ ئاستێکی بەرزتر و گەشاوەتر هەڵبڕن..

بەڵێ، خوێندن ئەو کلیلەیە کە مرۆڤ و کۆمەڵ لە چوارچێوەی قاوغێکی تەسک و تاریکەوە دەگوێزێتەوە بۆ جیهانێکی گەش و بەرفراوان و ئاشنای دەکات لە گەڵ رازو نیازی جیهان و دەوروبەری..

کەواتە خوێندن کلیلی شارستانێتییە، بەم پێیەش دەتوانین بڵێین: ئیسلام هەر لە یەکەم ساتی دابەزینییەوە کلیلی شارستانێتیی داوەتە دەست هەڵگرانی.. هەر بەمەشەوە نەوەستاوە، سیمای شارستانێتییەکەشی بۆ نەخشەکێشاوە، کە ئەویش شارستانێتیـ ـیەکە بە ناوی خواوە بنیات دەنرێ: ((اقرأ باسم ربك الذي خلق))..

ئەو شارستانییەش کە دوای یەک دوو سەدە لە جیهانی ئیسلامیدا بنیات نرا، لە ژێر رێنموویی ئەم چەند ئایەتە و چەندەها ئایەتانی تری لەم بابەتەدا بوو.

ئێستەش گەشتێکی سەرپێیی بە ناو برێک لەو ئایەتانەی تردا دەکەین کە بەراشکاوی موسڵمانان هان دەدەن بۆ گەران و پشکنین و

ئاشکراکردنی یاساو رێباکانی ژیان و گه ردوون ..

قورئانی پیرۆز ئاده میزاد به گشتی وه موسڵمان به تایبه تی هان ده دات که له گشت دروستکراو و دیارده کانی سروشت ورد ببنه وه و په نجه ی لێ وه رگرن .. هانی ده دات له چۆنیه تیی پێکهاتنی خواردنه که ی بکۆڵێته وه ((فلینظر الانسان الی طعامه . أنّا صببنا الماء صبّا . ثم شققنا الارض شقّا)) (عبس ـ ٢٤ ـ ٢٦) .. له چۆنیه تی دروست بوونی خۆی ((فلینظر الانسان مِمَّ خلق ـ الطارق ٥)) .. له ئاسمانه کان که کێڵگه ی زانستین له که ((قل انظروا ماذا فی السماوات و الارض ـ یونس ١٠١)) ((أفلَم ینظروا الی السماء فوقهم کیف بنیناها و زیّنّاها ـ ق ٦)) .. له مێژوو بکۆڵنه وه ((أولم یسیروا فی الارض فینظروا کیف کان عاقبة الذین من قبلهم ـ الروم ٩)) .. له گیانه وه ران ((افلا ینظرون الی الابل کیف خلقت .. ـ الغاشیة ١٧)) سه رنجیان بۆ زه وی و له شی مرۆڤ و سه رچاوه ی باران بارین راده کێشێت ((و فی الارض آیات للموقنین ، و فی انفسکم افلا تبصرون ، و فی السماء رزقکم و ما توعدون ..)) الذاریات (٢٠ ـ ٢٢) ..

هانیان ده دات بۆ زانستیی رووه کناسی ((انظروا الی ثمره اذا اثمر و ینعه)) (الانعام ـ ٩٩)

بۆ سه ره تای دروست بوونی بوونه وه ر و ژیان ((قل سیروا فی الارض فانظروا کیف بدء الخلق)) العنکبوت ـ ٢٠ هه روه ها ره خنه له وانه ده گرێت که زیری و هه سته کانیان له کار ده خه ن ـ که سه رچاوه ی گشت زانستێکن ـ ((و جعلنا لهم سمعًا و ابصارًا و افئدةً ، فما اغنیٰ عنهم سمعهم و لا ابصارهم و لا افئدتهم من شئ)) (الاحقاف ـ ٢٦) ..

خۆ ئه گه ر زیاتر بچین بۆمان ده رده که وێت ته نها گۆشه ـ یه کی زانست و مه عریفه ت نی یه که قورئان هانی موسڵمانانی نه دابێ بۆ فێر بوونی ..

ئه مه ی ئاشکرامان کرد مشتێک بوو له خه رمانێک .. ئه وه ی ده یه وێ زیاتر له م باره یه وه شاره زا بێت ده توانێت بۆ خۆی بچێته باخچه ی پر گوڵزاری قورئان و ، زیاتر به بۆن و به رامی به هره مه ند ببێ ..

کەواتە لە لایەنی (نظری)یەوە ئیسلام گەورەترین پاڵپشتێت و زەمینە سازدەرە بۆ زانست و پێشکەوتن .. بەلێ موسڵمانانیش لە چاویلکەی ئەم ئایەتانەوە بۆ خوێندن و زانستیان روانی، بۆیە لە ژێر دروشمی (الحكمة ضالة المؤمن، أنّى وجدها فهو أحقّ بها).دا بە چاوی رێزەوە بۆ گشت زانستێکی بە سوود دەیانروانی و ،هەولیان دەدا سوودی لێ وەرگرن .. بۆیە کاتێ کە لە پووری شارستانێتیی یۆنانیو فارسی و هیندی و .. هتد یان کەوتە بەردەست ،هەولی سرینە - وەیان نەدا .. بەڵکو لە بێژنگیان دا و ، لایەنە چاکەکانیان کرد بە بناغەی شارستانێتییەکی ئیسلامی ، وە لە ماوەیەکی کەمدا توانییان برەو بە زانیاری بە بەجێماوانە بدەن و ، چەندەها کتێبی بە نرخ لە بوارەکانی (پزیشکی و ئەندازە و لۆجیک و فەلسەفە و کیمیا و فەلەک و.. تاد) دا بنووسن و ، چەندەها کەڵەپیاوی وەک (فارابی و ئیبن سینا و خوارزمی و ئیبن رۆشد و غەزالی و

چەندینی تریان تیا هەڵبکەوێت کە تا ئێستەش ناویان دەدرەوشێتەوە.. توانیان شارستانێتییەک بنیات بنێن کە دۆست و دوژمن شایەتیی بڵندیی بۆ دەدەن و .. هەر ئەمیش بوو بووە رێ خۆشکەر بۆ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی (رینیسانس) لە ئەوروپاو ، سەرەنجام بە رپابوونی ئەم شارستانێتییەی ئەمرۆ ..

بەلێ ئەم شارستانێتییە حەوت سەدەی خایاند و ، لەو سەردەمانەدا پایتەختەکانی جیهانی ئیسلام مەڵبەندی زانست وزانیاری بوون و ، جیهانی ئیسلام تاکە هەڵگری مەشخەڵی پێشکەوتن بوو.. هەرچی ئەوروپا بوو لەو سەردەمانەدا لە ژێر ئەفسانەو زوڵم و ستەمی پیاوانی کەنیسەدا دەینالاند و ، لە تاریکیی نەزانی و دواکەوتوویی دا نوقم بووبوو..

بەلام دوای ئەوەی کە چەندەها هۆکار بوونە هۆی لاوازکردنی جیهانی ئیسلامی و ، زۆر لە شاکارە زانستییە - کانی کەوتنە دەست ئەوروپا، وردە وردە خۆری شارستانێتی لە جیهانی ئیسلامی روی لە ئاوابوون کرد و ، بە هەمان خێراییش لە سەر

جیهانی ڕۆژئاوا هه ڵهات .

ئه مڕۆش موسڵمانان کلیلی ژیار و شارستانێتی یان له ده ستدایه ـ که ئیسلامه ـ .. وه ئه گه ر به ڕاستی بگه ڕێنه وه بۆ ئیسلام بێگومان ئه و به کاروانی شارستانێتی یان ده گه یه نێته وه .. که واته ئیسلام هۆی دواکه وتنی موسڵمانان نه بووه و نی یه .. به ڵکو به پێچه وانه وه ، دواکه وتنه که یان هۆی دوور که وتنه وه یانه له ئیسلام ..

کۆتایی باسه که مان به م قسه یه ی عه للامه ( سدیو ) ده هێنین که له کتێبی ( تاریخ العرب ) دا ده ڵێ : (( له سه ده کانی ناوه ڕاستدا ته نها موسڵمانان خاوه نی زانست و فه لسه فه و هونه ر بوون .. وه پێیان نابێته هه ر جێ یه کێ بڵاویان کردۆته وه و ، له مانه وه دزه ی کرد بۆ ئه ورووپا ، وه هه ر ئه مان هۆی پێشکه وتن و بووژانه وه ی ئه ورووپا بوون )) ..

oooooooooooooooooooooooooo

//////////////////////////

## سه رچاوه کان :


(١) ناڵه ی ده روون / ب٢ / شێخ محمدی خال .

(٢) من المسؤول عن تخلف د . محمد سعيد رمضان البوطي

(٣) لماذا تأخر المسلمون و تقدم غيرهم / شكيب أرسلان ..

( ) الاسلام و الرجعية / صلاح الدين مجيد ..

(٥) حول اعاده تشكيل العقل المسلم د. عماد الدين خليل ..

( ) تهافت العلمانية / د . عماد الدين خليل ..

(٧) المسلمون أمام تحديات الغزو الفكري / ابراهيم نعمه.

عطا احمد رمضان

قورئانی پیرۆز تاکه به رنامه ی خوایه ، که دروستکه ری ئاده میزاده .. هه ر خۆیشی ده زانیت که دروستکراوه کانی چی یان پێویسته بۆ هه ر قۆناغێک له قۆناغه کانی ژیانیان .. جا بۆیه هه ر له سه ره تای هاتنی قورئانی پیرۆز له شاری مه ککه بۆ سه ر پێغه مبه ری ئازیزمان - دروودی خوای له سه ر بێت - هه تا سیانزه ساڵی ته واو ده رباره ی یه ک بابه ت ده دوا ..

به ڵێ ته نها یه ک بابه ت، به بێ گۆڕان، ته نها شێوازی پێشکه ش کردنه که ی جیاواز بوو .. ئه و بابه ته ش بابه تێکی زۆر گرنگ و گه وره و بنچینه یی بوو له م دینه تازه یه دا ، ئه ویش بابه ت و مه وضوعی بیروباوه ڕ - عه قیده - بوو، که ڕه نگی ده دایه وه له دوو خاڵی سه ره کیدا ، خوایه تی و به ندایه تی (الالوهیة و العبودیة) ، وه چۆنیه تیی په یوه ندیی نێوانیان ..

به ڵێ به ڕاستی ئه م بابه ته گرنگترین بابه تێکه که په یوه ندیی به مرۆڤه وه هه بێت ، چونکه بابه تی بوونی مرۆڤه له بوونه وه ردا و سه ره نجامی ژیانی.. وه چۆنیه تیی په یوه ندی یه که ی به بوونه وه ره وه و ، هه روه ها به دروستکه ری بوونه وه ره وه .. وه چۆنیه تیی په یوه ندیی به زینده وه رانه وه .. ئه مانه ش بابه تانێکن که هه رگیز گۆڕانیان بۆ نی یه ..

قورئانی پیرۆز گرنگی یه کی ته واوی دابوو به شیکردنه وه ی

نهێنیی مرۆڤ و نهێنیی ئەم بوونە وەرەی کە لەدەورو پشتیدایە، بۆیە هەمیشە پێی دەفەرموو : تۆ کێیت ؟ وە چۆن هاتیت ؟ وە بۆچی هاتیت ؟ وە سەرەنجام بۆ کوێ دەچیت ؟ وە کێ لە جیهانی نادیارەوە هێناویەتی؟ هەروەها پێی دەفەرموو : ئەم بوونەوەرەی کە دەیبینیت و هەستی پێدەکەیت چییە ؟ وە ئایا کێ کارەکانی ئەم بوونەوەرە رێکدەخات ؟ وە دەبێ چۆن ( معاملة ) و ( تصرف ) بکرێت لەگەڵ دروستکەری بوونەوەردا ؟ وە دەبێت پەیوەندیی نێوان بەندەکان چۆن بێت ..؟

بەڵێ ، بەم شێوەیە سیانزە ساڵ تێپەری لە هاتنەخوارەوەی قورئان.. وە پەیوەندیی بەردەوام هەبوو لە نێوان ئاسمان و زەویدا بۆ روونکردنەوەی ئەم بابەتە گرنگانە.. وە بێگومان قورئان بە هیچ شێوەیەک لەم بابەتە گرنگە بنچینەییانە تێنەدەپەری بۆ ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە یاسای ژیانەوە هەیە، کە لە چاو ئەم بابەتە گرنگەدا فەرعیاتن.

جا بۆیە پێویستە لەسەر بانگەرانی رێگەی خوا ئەم راستییە گەورانەیان لەپێش چاو بێت ، وە لەسەری راوەستن و لێی بکۆڵنەوە .. وە ئەوەی شایانی باسە ئەم شێوازە ئەوەنە بێت ئاسانترین شێواز بووبێت بۆیە دەستی پێکراوە بۆ چوونە ناو خەڵکی مەککەوە ، چونکە خۆیان باش تێدەگەیشتن لە واتای ( لا اله الا الله ) ، وە دەیانزانی ( الالوهیة ) واتە : فەرمانرەوایی ( الحاكمية ) تەنها دەبێت بۆ خوا بێت ...واتە سەندنەوەی هێز و دەسەڵات لە هەموو جادوگەر و سەرۆک و کاربەدەستان و گەراندنەوەی بۆ خوا.. وە واتە دەسەڵات گرتن بەسەر هەست و ویژداندا ، وە بەسەر عیبادەت و پەرستشەکاندا ، وە بەسەر ماڵ و سامانداو ، وە بەسەر لاشە و گیانەکاندا ، وە بەسەر هەموو رووداوەکانی ژیاندا .. وە بە شێوەیەکی گشتی ( لا اله الا الله ).. واتە شۆرش کردن بەسەر دەسەڵاتدارەکان لەسەر زەویدا ،

کە گرنگترین و گەورەترین مافی خوایەتی یان برد بوو بۆ خۆیان کە (الالوهیة) بوو ..

ئەوەشمان لە یاد نەچێت خۆ پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێت - کە بەراستگۆترین و دەستپاکترین کەس ناسرابوو، لەبەر ئەوەش بوو کرایە حەکەم بۆ دانانی بەردە ڕەشەکە، وە ڕازی بوون بە فەرمانی، وە لە تیرەی (بەنی هاشم) بوو کە بەڕێزترین تیرەی قوڕەیش بوو، دەیتوانی هەر لەوکاتەوە بەناوی یەکخستنی عەرەبەوە عەرەبەکان لە خۆی کۆ بکاتەوە، ئیتر ئەم نارەحەتی یەی نەدەویست سێنزە ساڵ .. بەڵام نەخێر .. چونکە بەرنامەی خوا بۆ ئەوە نەهاتووە زەوی ڕزگار بکات لە دەستی ستەمکارێکی (ڕومانی) یان (فارسی) بۆ ژێر دەسەڵاتی ستەمکارێکی (عەرەبی) .. چونکە ستەمکار هەر ستەمکارە ..

وە زەوی زەویی خوایە، دەبێت ڕزگارکردنی تەنها بۆ خوا بێت و، ئاڵای (لا الە الا اللە) لە سەری بەرز بکرێتەوە .. وەیان پێغەمبەری خوا - درودی خوای لە سەر بێ - دەیتوانی بانگەوازەکەی بەناوی بانگێکی کۆمەڵایەتی یەوە ئاشکرا بکات، وە دژی دەسەڵاتی زۆرداران بوەستێ، وەیان دژی ڕەوشت نزمی و بەدئەخلاقی خەڵکیی کۆبکردایەتەوە .. بەڵام دیسان نەخێر، چونکە خوای گەورە خوی زاناترە کە هەتا بیروباوەڕی پتەو لە دڵ و دەروونەکاندا جێگیر نەبێت، وە خۆشەویستی و برایەتی دروست نەبێت، بەکسانی و ڕزگاربوون دروست نابێت .. وە هەروەها ڕەوشتی جوان و بەرز بڵاو نابێتەوە.

بەڵام دوای ئەوەی بیروباوەڕ جێگیر بوو لەناو دڵەکاندا، وە تاقیکرانەوە و ئارامیان گرت، وە دوای ئەوەی هیچ حەزی نەفسیان نەما و، بەتەمای پاداشتی ئەم دنیایە نەمان، وە شانازی یان نەما بەڕەگەز و ڕەنگ و قەومو قەبیلە یان، ئنجا خوای گەورە زانی ئەمانە شایانی ئەوەن کە ئەو ئەمانەتە خوایی یە گەورەیە هەڵبگرن، وە دەستپاکن

لە وەی کە هێزو دەسەلاتیان پێ بسپێرێ و ئیش و کاریان لە ژێر دەستدا بێت، بۆیە ئەو کاتە پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر بێت - بە ئاسانی هەموو فەرمانەکانی خوای جێبەجێ دەکرد لە ناویاندا بە بێ بەکارهێنانی زەبروزەنگ یان (حدود و تعزیر)، مەگەر لە سەر چەند کەسێکی کەم و زمێررا و نە بێت ..

لە کۆتاییدا پێویستە ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە قۆناغی عەقیدە و بیروباوەر کە درێژەی کێشا لە مەککەدا دوورە پەرێز نە بوو لە قۆناغی کردەوە و جم و جووڵ و دروست بوونی کۆمەڵی موسڵمان .. کە واتە کە فێری عەقیدە و بیروباوەڕ کراون تەنها (نەظەری) نە بووە خوێندرا بێت و بەس ..!

بەڵکو دروست کردنی بینای عەقیدە و کۆمەڵی موسڵمان و جموجووڵی ئیسلامی بە یەکەوە بوو. کە واتە هەر کاتێک ویسترا ئەو بینایە دروست بکرێتەوە پێویستە هەر بە وشێوەیە بێت ..

خوای گەورەش یارمەتیدەر و رێ پیشاندەری ئەو کەسانەیە *

ooooooooooooooooooooooooooo

* لە (فی ظلال القرآن) / سەرەتای سورەی (الانعام) چاپی پێنجەم / ل (۷۹ - ۸۵) وەرگیراوە ..

(پەردە لادان لە سەر ئیسلام Unveiling of Islam) ئەو کتێبە نوێیە یە کە رۆژنامەنووس و (اعلامی) ی سویسری (روجیە دی پاسکوێ) بە زمانی فەرەنسی ی دایناوە، پاشان تەرجەمە کراوە بۆ زمانی ئینگلیزی ..

ئەم کتێبە لە (۷) بەش پێک هاتووە و. نووسەر. کەی - کە موسڵمان بووە - باسەکانی لەگەڵ ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەردا - دروودی خوای لەسەر بێت - تێهەڵکێش کردووە ..

نووسەر باس لە بەرزی و نەمریی ئیسلام دەکات و دایدەنێت بە ئایین و رێبازی نەمرو ئەبەدی .. وە هەروەها دەڵێت ئیسلام ئایینی هەموو سەردەم و، راستەقینە بەکی جێگیرە و، هەر دەبێت بمێنێت ..

هەروەها نووسەر دەڵێت : "کێشە و گیروگرفتەکانی جیهانی نوێ و وڵاتانی دی ئاوا تەمامی پەیوەندی یانە لەگەڵ خوای گەورەدا و، هۆی ئەوەیە کە عەلمانیەت جیاکردنەوەی ئایین لە ژیانی رۆژانەدا رۆچوون ..

شایانی باسە لەم ماوانەی رابردوودا چەند رۆژهەڵاتناس و ناسراوێکی تری وەک : (نۆ) ی سویسری و (هێرکهارد) ی سویسری و (رینیە گۆنیۆ) ی فەرەنسی موسڵمان بوون ..

پەیامنێری
گۆڤاری (پەیامی ڕاستی)

لەبەرواری ١ تا ٨ ی /١١/١٩٩٣ وەفدێکی ڕۆژنامەگەریی تورکی سەردانێکی کوردستانیان کرد و، زۆربەی شار و شارۆچکە پڕ لە ئاوارە و لێقەماوەکانیان بەسەر کردەوە.. ئەم وەفدە پێکهاتبوو لە پێنج کەس و، خاتوو (ئامینە شنلیک ئۆغلۆ) ی سەرنووسەری گۆڤاری بەناوبانگی (مەکتوب) ی تورکی هاوڕێیی دەکردن..

لەمیانەی گەشت و سەردانەکانیاندا سەریان لە مەڵبەندی گشتیی (کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامی) و (نووسینگەی پەیامی ڕاستی).. نووسینگەش کاتەکەی بەهەل زانی و، چەند ساتێک لەگەڵ خوشکە (ئامینە) ئەم وتووێژە سازکرا..

**پەیامی ڕاستی :** سەرەتا بەخێرهاتنی گەرمی خوشکی بەڕێز دەکەین و، داوای لێدەکەین کە وەک پێش کاروانێکی ئافرەتی ڕۆشنبیری تورکیا کورتەیەک لە ژیانی خۆی بۆ خوێنەران باس بکات..

**خوشکە ئامینە :** سوپاسی ڕێز لێنانتان دەکەم.. لە ڕاستیدا خۆشحاڵیی من لە ڕادەیەکدایە کە ناتوانم بە هیچ ڕستەیەک دەریبڕم. من ناوم (ئامینە شنلیک ئۆغلۆ) وە و، نیشتەجێی شاری

(ئەستەنبول) م .. لە سەرەتــای منداڵیمەوە حەزم دەکرد لــــە خوێندنەوەی زۆر و، لە دەرەوەی خوێندنگا ڕەسمی یەکان دەستــم کردە خوێندن .. خولیای لێکۆڵینە- -وەی ئاینەکان کەوتە سەرم و، بە درێژی هەوڵمدا خۆم لە ئاییــنی مەسیحیەت شارەزا بکەم، بۆیــە کەوتمە خوێندنەوەی ئینجیلەکان و بینیم پڕن لە (تناقضات) و، هەستم کرد کە دەستکاریی سڕۆقی تێدایە .. پاشان دیراسەی ئاینی ئیسلامــم کرد و کەوتمە خوێندنی زانستــە ئیسلامی یەکان ..

هەر لە سەرەتای گەنجیمــەوە زەوقی خوێندنەوە و نووسینم هەبوو، بۆیە تا ئێستا نزیکەی (١٩) کتێبم چاپ کراوە و بەکێکیان (٤٥) جــار چاپ کراوەتــەوە ..

لە دەوروبەری ساڵی (١٩٨٤) دا دەزگای ڕۆژنامەگەری و بــڵاو- کردنەوەی (مەکتوب) م کــردەوە و گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی گشتیی ژنانەمان دەرکرد بە ناوی (مەکتوب) ..

لە ساڵی (١٩٨٥) دا بــە هــۆی ڕەخنەیەکەوە کە لە سیاسەتــی

دەوڵەتی تورکی و شەخصی (کەمال ئەتاتورک) م گرت و، لە گۆڤارەکەدا بڵاوم کردەوە، دەستگیرکرام و، بە (شەش ساڵ و سێ مانگ) مەحکــوم کرام .. نزیکەی سێ ساڵم بردە سەر و ئازاد کرام .. سوپاس بۆ خوا لــە زینداندا توانیم زۆرێک لــــە ئافرەتە زیندانی یەکان - کە بــە تاوانی خراپکاری و (مخــــدرات) گیرابوون- لە ئیسلام تێبگەیەنم.. بۆیە زۆرێکیان حیجابیان کــرد و، سەرەنجام دوور خرامەوە بــۆ زیندانێــکی تر.. سوپاس بۆ خوا لە زیندانی یەکەم خۆشتــرم بە سەر بــرد، چونکە توانیم لــە زینداندا (٧) کتێب بنووســم و زۆر بخوێنمەوە و، گــۆڤــارو ڕۆژنامە دەگەیشتنە دەستم ..

ئێستەیش بەڕێژەبەری ناوەندی بڵاوکردنەوەی ( مکتوب ) و سەرنووسەری گۆڤاری ( مکتوب ) م کە تایبەتە بە ئافرەتانەوە ..

**پەیامی ڕاستی:** بەڕای جەنابتان بواری کاری ئافرەت لەدەرەوەی - ماڵدا چیە ؟

**خوشکە ئامینە :** لەڕاستیدا ڕای من ڕای شەرعی ئیسلامە کە دەڵێ : چاودێری کەسایەتی ئافرەت و هەست و سۆزی بکەن و حاڵەتە لاشەیی و فسیۆلۆژی یەکانی ڕەچاوکەن بۆیە بەلامەوە باشترین بواری کاری ئافرەت ئەمانەن :

- فێرکردنی کچان .. پەروەردەی منداڵان .. پیشەی پزیشکی بۆ بواری ئافرەتان .. ( باحثەی اجتماعی ) .. ، خەیاتی .. وە هەرکارێکی تر کە بخوا بەباری دەروونی و لاشەیی ئافرەت .. بەلام هەموو ئەمانە مەرجی ڕەچاو کردنی چۆنیەتی یە شەرعیەکانیان لەگەڵە .

**پەیامی ڕاستی:** ئەی کاری سیاسی ؟ بۆنموونە چوونە حیزب یا چوونە پەرلەمان ؟ دەنگدان یا خۆ پالاوتن بۆ ئافرەت بەلاتانەوە چۆنە ؟

**خوشکە ئامینە :** ئەگەر باری سیاسی هەرولاتێک بەشداری ئافرەت بخوازێ نەک هەر گونجاو و پەسەندە بەڵکو پێویستیشە ، گرنگ ڕەچاو کردنی مەرج و تایبەتمەندی ژنێتی یە ، وەک وتمان .

**پەیامی ڕاستی:** ئەی لە بواری کاری دەعوەی ئیسلامی دا ئافرەت دەبێ چ دەورێکی هەبێ ؟

**خوشکە ئامینە :** گرنگ ترین کاری ئافرەت لەو بوارەدا :

سەرەتا یارمەتی هاوسەری یەتی ئەگەر ژنی ماڵ بێت . یا براو کەسی ئەگەر کچە ، ئەمە لەڕاستیدا گرنگترین و یەکەم ئەرکە . .

ئەوەش بە ڕێکخستنی کاروباری ماڵ و دڵخۆشکردن و دڵگەرمکردنی مێردو پێشوازی گەرمی میوان و کاری تری لەم بابەتە دەبێ ، پاشان ئەگەر بگونجێ ماموستای خوێندگەی شەرعی ژنانە بێت کارێکی زۆر چاکە ، یا مۆستاو پەروەرشیار بێت ، چونکە زیاتر سەروکاری دەبێت لەگەڵ خەڵکیدا .

**پەیامی ڕاستی:** جەنابتان وەک سەرنووسەرێکی گۆڤاری ( مکتوب )

که‌ ئه‌زموونێکی نۆساڵه‌تان له‌ بواری ڕۆژنامه‌گه‌ریی‌دا هه‌یه‌ پێشنیار و تێبینیتان بۆ گۆڤاری (په‌یامی ڕاستی) چیه‌؟

**خوشکه‌ ئامینه:** ده‌توانن هه‌میشه‌ داهێنکاری (ابداع) تان هه‌بێت با بابه‌تی ساده‌ و ساکاریش بێت، چونکه‌ خوێنه‌ر هه‌میشه‌ سه‌ودای گۆڕان و هه‌مه‌ره‌نگی بابه‌ت و نووسینه‌.

داواده‌که‌م که‌ گه‌له‌که‌تان له‌ پیلان و ته‌ڵه‌که‌ی جیهانیان ئاگادار که‌نه‌وه‌، هانی ئافره‌تان بده‌ن که‌ متمانه‌یان به‌ خۆیان زیاد ببێت.. ده‌توانن به‌ڵگه‌ی قورئانیی زۆر بهێننه‌وه‌ که‌ هه‌ڵوێستی غه‌یره‌ دینی له‌گه‌ڵ موسڵمان چۆنه‌؟ قورئان ئایه‌تی زۆری له‌م باره‌یه‌وه‌ هه‌یه‌ که‌ به‌داخه‌وه‌ زۆر گوێیان بۆ شل ناکه‌ین و لێیان ناکۆڵینه‌وه‌.

داوا ده‌که‌م کاتێ باسی ئافره‌ت ده‌که‌ن، باسی ئه‌رکی پیاویش بکه‌ن یا به‌پێچه‌وانه‌وه‌.. زۆر که‌س باس له‌ (ماف) ده‌کات، به‌ڵام چۆن (ماف) دابین ده‌بێ؟ ئه‌مه‌ باس ناکرێ، دیاره‌ به‌ به‌جێهێنانی (ئه‌رکێ) ماف دابین ده‌بێ، ئه‌گه‌ر کۆمه‌ڵگه‌ و ده‌وڵه‌ت و پیاوی هاوڕێی ئافره‌ت به‌ (ئه‌رکێ) ی خۆیان هه‌ستن (ماف) ی ئافره‌ت دێته‌ جێ.. ده‌ی که‌واته‌ باسی ئه‌رکه‌کان بکه‌ن و شییان بکه‌نه‌وه‌..

**په‌یامی ڕاستی:** ئه‌گه‌ر زه‌حمه‌ت نیه‌ هه‌ڵوێستی خۆتان له‌ پاڵ باسی هه‌ڵوێستی حکومه‌تی تورکیا شی بکه‌نه‌وه‌.

**خوشکه‌ ئامینه:** له‌ ڕاستیدا ئێمه‌ هه‌میشه‌ وتوومانه‌ ڕه‌گه‌ز په‌رستی تاوانه‌، هه‌ر هاووڵاتی‌یه‌کێ مافی خۆی هه‌یه‌ و نابێ هیچ ئیعتبارێکی ڕه‌گه‌زی و مه‌زهه‌بی و نه‌ژادی کار بکاته‌ سه‌ر ئه‌و مافه‌..

ئێمه‌ سۆزی خۆشه‌ویستیی کورد گه‌یاندوونیه‌ته‌ ئێره‌.. به‌ڵام به‌داخه‌وه‌ حکومه‌تی تورکیا ئاماده‌ نیه‌ ڕێز له‌ مافه‌ ڕه‌واکانی گه‌لی کورد بگرێ و هه‌ڵوێستی چه‌ند لایه‌نێکی کورده‌کان تێکه‌ڵ به‌ کێشه‌ی ئه‌و گه‌له‌ ده‌کات.. ئێمه‌ به‌ ڕاشکاوی ده‌ڵێین تورکیا پیلانێکی خارجی له‌سه‌ر گه‌لی کورد پیاده‌ ده‌کا، چ به‌ خۆی بزانێ یا نه‌زانێ.. بۆیه‌ خۆمان به‌ری

دەکەین لەو هەلویستە ناشایستەی حکومەتی تورکیا دەربارەی کورد و کوردستان هەیەتی.

**پەیامی ڕاستی:** دەربارەی دەرکەوتنی ئافرەت لە ناوەندە جۆراوجۆرەکاندا ڕاتان چییە و حیجاب چۆن دەناسێنن؟

**خوشکە ئامینە:** حیجاب مەرج و سنووری لە ئیسلامدا ئاشکرایە ، لەوە گرنگتر ئەوەیە کە ئافرەت کەسایەتی خۆی بپارێزێ.. چوونە دەری بێ جێ و خۆئارایش دان بۆ نامەحرەم دژی سروشتی ئافرەتە ، بەلگەش ئەوەیە کە ئایینی خوا حەرامی دەکا ، گرنگ ئەوەیە کە ئافرەت چووە دەرەوە بزانێ بۆ کوێ دەچێ و بۆچی دەچێ و چۆن دەچێ؟ وەلامی ئەوە بچێ یان نەچێ، بەمەرجی وەلامی ئەو سێ پرسیارە دیاردە بێت..

**پەیامی ڕاستی:** دەربارەی دەرکەوتن لە تەلەفزیۆن و پێش - کەشکردنی بەرنامە لەسەر شاشە یا لە ڕادیۆ ڕاتان چییە؟

**خوشکە ئامینە:** عەرزم کردن گرنگ ڕادەی پێویستە ، دەرکەوتنی سەر شاشە هەروەک دەرکەوتنی بازارە ، بگرە ئاسان و ساکارترە ، گرنگ ئەوەیە بۆ خۆ نواندن نەبێ بەلکو بەشداری چالاکییە کۆمەلایەتییەکان بێت ، دەربارەی حوکم ئاشکرایە ، ئەویش فەرموویەتی کە بەدەنگی سەرنج ڕانەکێشێ و لەمەبەستی شەرعی و هەدەفی ڕاستقینەی قسەکردن لانەدات ( فَلا يَخْضَعْنَ بالقولِ فيطمعَ الَّذي في قَلْبِهِ مَرَض ) بەدوایدا دەفەرموێ ( وقُلْنَ قَوْلاً مَعْروفا ) گرنگ ئەوەیە بە نازو نووک قسە نەکا و قەولی ( معروف ) واتە شیاوو پەسەند بێت بەدەمیا .

**پەیامی ڕاستی:** مەشهورە کە حوکم دراوی بە شەش سال زیاترو نزیکەی سێ سال زیندانیت دیوە .. ئەگەر دەگونجێ هۆی ئەو حوکمە بفەرموو لەگەل باسی ( خاطرە ) یەکی زیندانیدا ؟

**خوشکە ئامینە:** هۆی گرتنم ڕەخنە گرتنی بوو لە سیاسەتی ڕژێمی تورکیا و بۆچوونەکانی ئەتاتورک.. بەلام لە ڕاستیدا بووە مایەی خێر، چونکە کاتێ ژنە زیندانییەکان لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا باسەکەی منیان خوێندەوە و ، زانییان لەسەر

هه ق وتن گیراوم ده وریان لێ دام و دامێن گیرم بوون ، منیش ئه مه م کرده هه ل و بانگم کردن بۆ ئیسلام ، سوپاس بۆ خوا زۆربه یان خوا هیدایه تی دان .. یه کێ له(خاطره)کانم که هه میشه دێته وه یادم ئه وه بوو که : ئافره تێکی مه سیحیی ئه ڵمانی به ناوی ( مۆنیکا ) له ته کما له زیندان بوو.. لێم پرسی : " بێ تاقه تی ناکه یت له م دووره ولاتی و غه ریبی یه دا ؟ " وتی : " ئامینه خان! من غه ریب نیم .. له ڕاستیدا تۆ و ئه وانه ی وه کۆ تون غه ریبن ..! من هه رچی سه یری ته له فیزیۆن ده که م و فلیم و به رنامه کانان ده بینم هه مووی به دڵی ئێمه و ئه وروپی یه کانه و، جیاوازیی نی یه له گه ڵ ئیعلامی لای خۆمان .. به ڕاستی ئێوه غه ریبن له ساحه که دا، من هه رچی ئه بینم وه کۆ خۆم وایه .. بیرکردنه وه وبۆچوونی ، پۆشاکۆ و به رگی ، جم و جووڵ و عاده تی ، ته نانه ت یاسای ولات و سیاسه تی حکومه ته که تان .. ئیتر له چی بێ تاقه ت بم ؟! به ڕاستی هه ق بوو من له تۆ بپرسم : له م ولاته غه ریبه دا چۆن ده ژین ؟ !! " .

**په یامی ڕاستی :** چه نابتان زیاتر به چی یه وه سه رگه رمن ؟

**خوشکه ئامینه :** ـ وه کۆ وتم ـ من سه رنووسه ری گۆڤاری ( مه کتوب)م که گۆڤارێکی تایبه ته به ئافره تان و مانگانه (١٢٠٠٠) ژماره ی لێ ده رده چێ و سوپاس بۆ خوا له هه موو تورکیا دا بلاو ده بێته وه .. جگه له وه خانه ی بلاوکردنه وه ی ( مه کتوب)یش ده به ین به ڕێوه ،که بلاوکراوه و نووسراوی هه مه چه شنه چاپ ده که ین و بلاو ده که ینه وه .. پاشان ئێمه له زۆربه ی بۆنه کاندا کۆنگره ی تایبه ت به ئافره تان له تورکیا و ئه وروپادا ده به ستین .. جگه له مانه ش ڕێکخراوێکمان هه یه به ناوی ( پارێزگاریی ژینگه و خزمه تی مرۆڤ ) که له هه موو تورکیادا لقی هه یه ..

**په یامی ڕاستی :** چی هانی دایت سه ربده یت له کوردستان ؟ تێبینی و سه رنجت له سه فه ره که ت چی یه ؟

**خوشکه ئامینه :** له ڕاستیدا له مێژه خولیای سه رمانه که له

نزیکه وه له ژان و خه فه تی که لی کورد نزیک ببینه وه ، ته نانه ت له دوای ڕووداوی ئه نفال کردن و کیمیا باران و ڕه وه ملیۆنی یه که ..
به لام خوا ده رفه ته که ی خسته ئه م پایزه .. ئه وه ی ڕاستی بێ ئێسته کتێبێکم به ده سته وه یه که ده مه وێ بینووسم ، ڕۆمانێکه ده رباره ی خێزانێکی کیمیاباران کراوی کوردی هه ڵه بجه یی ، حه زم کرد خۆم ببمه ( شاهد عیان ) ی ڕووداوه کان و که له به ره سه ره کی یه - کانی ڕۆمانه که ی پێ پڕ بکه مه وه.. جگه له وه ش مه به ستمان بوو وه ک ڕۆژنامه چی یه ک واقیعی کورد و کوردستان به رینه وه ئه وروپا .. بۆیه پشت به خوا ژماره ی داهاتووی گۆڤاری ( مه کتوب ) تایبه ت ده که م به کوردستانه وه.
له ڕاستیدا ئه م ریاره ته م له خه ون ده چی . چونکه به ڕاستی هه رگیز نه مده زانی که که لی کورد تا ئه م ڕاده یه خاوه نی ڕه وشتی به رز و بڕوای پاک و داب و نه ریتی ڕه سه نن .. هه رگیز باوه ڕم نه ده کرد که هێنده گه لێکی خوا ناس و ئاشتی ویست و سینه سافن .. له ڕاستیدا من پیرۆزبایی ئه م خۆڕاگری و مه بر و سنگفراوانی گه لی کورد ده که م له ئاشتی ئه و گشت پیلانه ناوچه یی و نێو ده وڵه تی و ئابلۆقه چه ند جاره یه ی تووشی هاتوون ..

**په یامی ڕاستی** : له مه زیاتر کاتتان ناگرین .. ئه گه ر دوا وشه یا تێبینی یه کتان هه یه بیفه رموون..

**خوشکه ئامینه** : هه مان مه به سته پێشووه کان دووپات ده که مه وه و ، هیوادارم ڕێز و سلاوم به ده سته ی نووسه ران و کارگێرانی تری گۆڤاره که تان بگه یه نن ..

**په یامی ڕاستی** : ئێمه ش سوپاستان ده که ین .. یاخوا سه ربه رز و سه رکه وتوو بن .

(( و من آیاته أن خلق لكم من انفسكم ازواجاً لتسكنوا إليها وجعل بينكم مودةً ورحمةً )) / الروم ٢١ .

ئاشکرایە کە خێزانی بەختەوەر و ئاسوودە بەردی بناغەی کۆمەڵگەی سەرکەوتووە .. وە لە هۆ گرنگەکانی پێکهێنانی خێزانی ئاسوودەش هەڵبژاردنی باش و پێکەوگونجانە لە نێوان هەردوولادا لە ڕووی بیر و هەست و بۆچوونەوە ..

بە ناوی نووسینگەی ( پەیامی ڕاستی ) یەوە گەرمترین پیرۆزبایی دەکەین لەم دوو خێزانە نوێیە ..

١ - بەڕێز کاک عەزیز ئالانی و خوشکە ئامینە علی جلال، کە بوونە هاوسەری یەکتر لەسەر (هەدیە) ی یەک قورئانی حازر و (١٩) مثقال ئاڵتوونی قەرز ..

٢ - بەڕێزان کاک فاتح عبدالله عبدالرحمن و خوشکە زەکیە فتاح قادر، کە بوونە هاوسەری یەکتر لەسەر (٢) مثقال ئاڵتوونی حازر و (١٩) ی قەرز ..

داواکارین لە خوای گەورە کە لەسەر خێر و خۆشی و بەرەکەت کۆیان بکاتەوە و ببنە نموونەی خێزانی بەختەوەر ..

نووسینگەی پەیامی ڕاستی

المخدرات

مامۆستا
بەکر حمە صدیق

وەک دەبینین لەم ماوانەی دواییدا هێرشێکی بەرفراوان لە ئاستی جیهاندا بۆ لەناوبردن و نەهێشتنی ماددە سڕکەرەکان دەستی پێکردووە.. ئەم بەلایە بووەتە لێشاوێکی توند و، خەریکە کۆمەلگاکانی جیهان، بەتایبەتی رۆژهەلاتی ناوەڕاست لەگەل خۆی رامالێت. لەوکاتەوە بازرگانیی ماددە سڕکەرەکان دەستی پێکردووە و، وەکو شێرپەنجە تێکەلاو بەگۆشت و خوێنی ئەو کۆمەلگایانە بووە.. جا لەبەرئەوەی بەکارهێنان و سەودا پێکردنی ئەم ماددانە ئەمڕۆ بووەتە مەترسییەکی گەورە لەسەر باری کۆمەلایەتی و ئاکاری و ئابووریی کۆمەل، جێی خۆیەتی ئەگەر بەکورتی تیشکێک بخەینە سەر ئەو باسە..

**ماددە سڕکەرەکان چین..؟**

ئەو ماددە کیمیاییانەن کە توانای گۆڕینی حەز و سروشت و دەروونی مرۆڤیان هەیە و، زۆر بەکارهێنانی خاوەنەکەی ناچار دەکات نەتوانێ بەئاسانی دەستبەرداریان ببێت.

گرنگترینیان ئەمڕۆ بریتین لە (ئەلکهول، ڤالیۆم، مۆرفین، هیرۆیین، حەشیشە، کۆکایین، ماریجوانا، لەگەل ماددەیەکی تر

که به ئاوێته ی کیمیاییی ده گیرێته وه پێی ده ڵێن (کانابیزۆ) هێماکه شی ئه م سێ پیته ئینگلیزی یه یه (L-S-D).

ئه مرۆ مادده ی (هیرۆیین) باوترین جۆری مادده سڕکه ره کانه .. کاتی خۆی وه کو چاره سه ری نه خۆشی له جیاتی (مۆرفین) به کارده هێنرا .. له ڕێگه ی ده رزیی باسکه وه بۆ لابردنی ئێش و ئازار . که چی ئه وانه ی له سه ر ئه م مادده سڕکه ره (مدمن) بوون به ده رزی له لامل ی خۆیانی ده دهن بۆ ئه وه ی - به لای خۆیانه وه - له زه تی زیاتری لێ بچه ژن ..

ئه و که سه ی گیرۆده ی (ادمان) به مادده ی هیرۆیین ده بێت ، ئه گه ر ماوه ی (١٢) سه عات ئه و مادده یه ی لێ ببڕێت ، نائارامی و شڵه ژان و لاوازی یه کی ته واو ڕووی تێ ده کات و ، نرکه و ناڵه ی لێ به رز ده بێته وه و ، چین چین جوانا و ده رده دات ، له گه ڵ قه تیس مانی فرمێسکی چاو و ئاو به لوتدا هاتنه خواره وه .. ئه گه ر بزانه که ماوه ی (١٨ - ٢٠) سه عاتی تر بخایه نێت ئه وه دونیای لێ ده بێته دۆزه خ و ، هاوار و قیژه ی زیاتر ده کات و ، پله ی گه رمای له شی نزم ده بێته وه و ڕیخۆڵه کانی ده ست به ئازار ده که ن و ، ژانه سکێکی زۆر ترسناکی ده یگرێته وه و ، دیواره کانی ناوه وه ی گه ده ی ده ڕووشێن و ده ست به ڕشانه وه ده کات و هه ندێ جاریش ڕشانه وه که ی خوێنی پێوه یه و سکچوونێکی به رده وامیشی له گه ڵ ده بێت ، که له وانه یه له ڕۆژێکدا بکاته (٦٠) جار .. خۆ ئه گه ر بزانه که بۆ ماوه ی (٣٦) سه عات به رده وام بێت ، ئه وا ئه و که سه وه کو شێتی لێ دێت و ، پله ی گه رمای به ڕاده یه ک نزم ده بێته وه ده ست به له رزین ده کات و، به شێوه یه ک لاواز ده بێت که نه توانێت سه ر به رز بکاته وه ، چونکه ڕۆژانه (٦) کیلۆ کێشی داده به زێت ..

کاتێ نه خۆش ده گاته نه خۆشخانه له قۆناغه کانی چاره - سه ردا پزیشک ڕاده سپێرێت که بۆ ماوه ی (٦٠ - ٧٠) ڕۆژ نه هێڵرێت له هیچ مادده یه کی سڕکه ر نزیک بێته وه .. به و جۆره جه سته ی ئاسایی ده بێته وه و، دژایه تی (مناعة) به رانبه ر مادده ی هیرۆیین تیایدا دروست ده بێته وه..

ده بێ بزانین هه رگیز ئه و که سه له ئاسه واری ئه و مادده ترسناکه ڕزگاری نابێت و، کاریگه رێتیی مادده که له سه ری ده یکات، که سێتی یه کی تووڕه و لاوازو ده روون به زیو.. ئه و که سانه ش پاش چاک بوونه وه له بنکه ی ته ندروستی یه کان ده رده چن، هه رکات رێژه ی خوێنیان نزم بوویه وه ئه وا (.. ۱) ئه وه نده ی که سێکی برسی حه ز به خواردن بکات، ئه و حه ز به مادده (هیرۆیین) ه که ده کاته وه..

گرنگترین هۆکاره کانی (ادمان) بوون ئه مانه ن:

۱ ـ هۆکاری ده روونی
۲ ـ هۆکاری کۆمه لایه تی
۳ ـ هۆکاری ئابووری

**یه که م: هۆکاره ده روونی یه کان:**

أ) دڵه ڕاوکێ و بێزاری:

هه ندێ که س که تووشی دڵه ڕاوکێ ده بن. هێزی به ره نگاری ون ده که ن و سه ر ده که نه خواردنه وه، یان ئه گه ر بۆیان لوا ئه وا مادده ی سڕکه ریش به کار دێنن تا له ئه نجامدا تووشی (ادمان) ده بن..

ب) هه ست به نائه واوی کردن:

خواردنه وه ی ئه رابی سه رخۆشکه ر و مادده ی سڕکه ر هه ستێکی درۆینه به گه وره یی له دڵی ئه و که سه دا دروست ده کات.. زۆرجار ڕێ ده که وێت که سێکی وا به و جۆره بیه وێت به خواردنه وه یان مادده ی سڕکه ر ئه و له که یه بپۆشێت..

ج) گه ران به شوێن خه یاڵی له زه تدا:

ئه وانه ی بازرگانیی به و مادده سڕکه رانه وه ده که ن وا بڵاو ده که نه وه که گوایا ئه و ماددانه مرۆڤ ده خه نه نێو ئامێزێکی پڕ له زه ت و که یفێکی خۆش.. له ڕاستیشدا که سێک ئه و شتانه ی له ژیاندا لێ ون بووبێت زۆر به ئاسانی باوه ڕ به و قسه یه ده کات.

د) شکست هێنان و تێکشکان:

هه ندێ خێزان زیاد له پێویست ناز به منداڵه کانیان ده ده ن، تا به شێوه یه کیان لێ دێت که گه وره بوون به رگه ی بچوکترین شکست نه گرن و، هه ر ئه وه نده ت زانی سه ری کردووه ته خواردنه وه یان مادده یه کی سڕکه ر و تووشی

به لاکه بووه .

هـ) په ژاره : ڕوودانی کاره ساتی دلّته زین ، وه کو مردنی باوکێ یان دایکێ یان دۆستێکی خوشه ویست یان ڕوودانی نه هامه تی یه کی ئابووری ، زۆرجار ده بێته هۆی ئه وه ی بوارێکی هه ناسه ـ دان بۆ خاوه ن کاره سات نه ره خسێت . جا لێره دا ئه گه ر که سێتی یه کی لاوازی هه بوو خێرا په نا بۆ خواردنه وه یان به کار- هێنانی مادده ی سڕکه ر ده بات و . له وێوه تووش ده بێت .

و) (التزام ) کردن و پابه ندبوون به یاساو هه لومه رجه کانی ئایینی ئیسلا مه وه ، ئه و که سه له ده ردی تووش بوون به و به لایه د وور ده خاته وه .. جا له به رئه وه ده بینین هه موو ئه و که سانه ی شه رابی سه رخۆشکه ر ده خۆنه وه ، یا مادده ی سڕکه ر به کارد ێنن ئه وانه ن که پابه ندی ئایین نین و گوێ بۆ قسه و باسی ئیسلام ناگرن .

جا نه بوونی پالّنه رێکی ئایینی له نا و خودی مرۆڤدا ڕێ خۆشکه رێکی تره بۆ ئالووده بوون به ده ردی خواردنه وه یان به کارهێنانی مادده سڕکه ره کان .

**دووه م : هۆکاره کۆمه لایه تی یه کان :**

گرنگترینیان ئه مانه ن :

أ) لێکێ پچرانی شیرازه ی خێزان، وه کو ڕوودا وی (ته لاق) که به ردی بنا غه ی خێزان له بن دێنێت و ، ئه ندا مه کانی سه رگه ردان و ڕوو له ئاواره بوون ده کات ، به تایبه تی مندالّ .. که له وانه یه ناچاری بکات په نا بۆ خواردنه وه به رێت .

ب) ژیانی ته نیایی :

هه ندی که س حه ز به تێکه لاویی که س ناکه ن ، مه یلیان به قسه و باس له گه لّ که س نی یه .. ئه و که سه به هۆی ئه م سیفه ته وه تووشی گۆشه گیریی ده بێت .. له ئه نجامدا خه یالات و بیری خراپ یاری به عه قلّی ده که ن و ، له وانه یه به ره و چالّی خواردنه وه یان مادده سڕکه ره کان هه نگاو بنێت و، له وێوه تووشی ( ادمان ) ده بێت .

ج) هاوه لّی خراپ :

زۆر جار وا ڕێکێ ده که وێت ئه و که سه داخوازی خواردنه وه نی یه ، به لام به هۆی هاوه لّی خراپه وه

له موناسه به یه کدا ده خواتــــه وه و، ئیتر به ره و (ادمان) بوون بـــه ڕێ ده کــه وێــت .

**سێــیه م : هۆکاره ئابووری یه کان :**

گرنگترین هۆکــاره ئابووری‌یه‌کــان ئه مـــانــــه ن :

أ ) بێکاری ..

ب ) نابه رابه ری له ئاستی ژیاندا ..

ج ) نه خستنه گه ڕی وزه کان ..

له وانه یه نه بوونی کارێکـــــی گونجاو و شه ریف که لێنێکی گـــه وره له ژیانی خه ڵکدا به جێ بهێڵێــت .. ئه مه سه ره ڕای ئه وه ی که ده بێتــه هۆی دروست بوونی بۆشایی یه کـــــی گه وره له نێوان ئاستی ژیانــــــــی خه ڵکدا و ، نابه رابه ری له ئاســتـــی ژیاندا دروست ده کات ..

کۆمه ڵێک نانی نی یه بیخوات، که چی کۆمه ڵێ سیغناخـــی خـــوا رد ن و خواردنه وه یه .. له م که یـــــن و به ینه دا وزه و توانا و جموجـــــووڵ ده مرێـــت ، یان هیچ نه بـــێ لاواز ده بێت و ، له ئه نجامدا خاوه نه کـه ی تووشی ده زدی بێ ئومێدی ده بـــێ و زۆر نزیکه سه ر بکاته خواردنه وه بۆ له بیرکردنی ئه و واقیعه تاڵـــــه و، له وانه شه له کۆتــاییدا سه ری لـه به کارهێنانی مادده سڕکه ره‌کانـه‌وه ده رُبچێـــت . *

---

* بۆ ئـه م بــــاسـه ســـوود له م سه رچاوانــــه وه رگیراوه :

(١) گۆڤاری (العالم) / ژماره ٢٧٤ ساڵــی ١٩٨٩ ز .

(٢) گۆڤاری (الفیصل) / ژمارد ١٢٦ لاپــه ره (٨٣) / د. ماهر محمـــــود الـــغـــواري .

**مامۆستا عمر ڕێشاوی**

ئاوەدانکردنەوەی زەوی و ئاودێرانی کشتوکاڵ سەرەرای ئەوەی کە دوو ڕەوشتی جوان و دوو هیوایەتی شارستانین، لەهەمان کاتیشا دوو دیاردەو کاری ئابورین لەگەڵ ناوچەکانی ولاتماندا ، جوتیاران و کارکەرانی لادێکان بەزۆری تێیدا دەژین و پێیەوە خەریکن. بۆیە بەچاکمان زانی ئەڵقەی ئەمجارەمان لە گۆشەی فیقھ بەمدوو سەرباسە بەیارمەتی خوا ڕەنگدارو ڕازاوە بکەین.

چاکێ وایە لەسەرەتاوە هەندێ لەگەڵ یەکێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەرماندا (دروودی خوای لەسەربێت) بژین کە دەفەرموێ : ( مامن مسلم یغرس غرسًا أو یزرع زرعًا فیأکل منه طیر أو انسان أو بهیمة إلاّ کُتب له به صدقة ). واتە : هەر موسوڵمانێک درەختێک دەڕوێنێ، نەمامێک دەنێژێ، یاخود کشتوکاڵێک دەکات ، ئنجا تەنها باڵندەیەک یان تەنها مرۆڤێک یان تەنها ئاژەڵێک وەک مەڕو ماڵات و زیندەوەرەکانی تر ج ماڵی یان کێوی لێی دەخوات بەخواردنی هەریەک لەمانەو، یەک جاریش بێ، بەو یەک خواردنە چاکە (صدقة) یەک بۆ جوتیارەکە دەنوسرێت.

ورد بوونەوە یەک : داینێین کە درەختەکە درەختی (توو) بێت ،

له ڕۆژێكدا چه ند چۆله كه لێی ده خوا، گریمان، یه كێ جار (١٠٠) چۆله كه لێی بخوات ئه وه (١٠٠) چاكه (صدقة) ، خۆ چاكه ش پاداشته كه ی لای خوا (١٠) ئه وه نده ی خۆیه تی، كه ده كاتــــه ١٠٠×١٠=١٠٠٠ چاكه ، ئه مه بۆ لـــێ خواردنی یه كێ جارو یه كێ ڕۆژ كـــه ته نها چۆله كه سه ردانی دره خته كه بكات و لێی بخوات . ئ ی چۆنـــه ئه گه ر له هه مان ڕۆژو هه مـــا ن كاتدا مرۆڤیش له و دره خته بخوا ت ، یه كێ یان دوو یان هه رچه نـــــــد هه روه ها ئاژه ڵیش لێـــی بخــــوات ئه ویش یه كێ یان دوو یان هـــــه ر چه نـد ؟! ئه مه یش ته نها بۆ یه كێ ڕۆژ و یه كێ ژه م، بیر له وه بكه ره وه كه لێخواردنكه چه ند ڕۆژێكێ بێت به ماوه ی به رداری ی دره خته كه دوپات ببێته وه ئه و كاته ده بێ بڵێیـــن : (١+١)١٠×١٠٠+١٠٠٠ = ١٠٢٠ چاكه ( صدقة ) له یه كێ كاتدا و بۆ یه كێ ژه م و بـــه لایه نی كه مه وه . .

چۆن ده بینی ئه گه ر جوتیاره كـــــه نه كێ یه كێ داری (توو) به ڵكو چه ندیـن داری (توو) ی ڕواندبێ، وه نــــه كێ هه ر داری (توو) به ڵكو چه ندین داری تری به رداری وه كێ مێو و چواله و هه نجیرو دره ختی تری ڕواندبـــێ ، وه ته مه نی دره خته كه نه كێ ساڵێكێ به ڵكو ٢٠ ساڵ و ٤٠ساڵ كه دره ختی واهه یه زۆر ساڵ ده ژی و به روبومـی به رده وام ده بێ و بۆ جوتیاره كـــــه ده بێته ( صدقة ) ی جاریه و له دوا ی مردنی جوتیاره كه ش بــــــه رده وام ( صدقة ) ی بۆ ده ڕوات و نابڕێـت ، وه كێ فه رموده ی ( **إذا مات ابـــن آدم انقطع عنه عمله الا من ثـــلا صدقة جاريـه ...**) ده فه رموێـت و ده یگه یه نـــێ . . .

ئه مه ی كه وتمان له ڕووی پاداشـت و ده ستكه وتی جوتیارێكی موسوڵمـا ن كه له خه زێنه ی بێ پایان و دوایـــی نه هاتووی خوای په روه ردگار بــــه جوتیاره كه ده گات و له تۆمارگـــه ی كرنه وه كانیدا بۆی تۆمار ده كرێت .و لای په روه ردگاری گه وره بـــــۆی ده ژمێرێت ، كه ئه میش لایه نێـــكێ له و نهێنی یه مان بۆ ده رده خات كه خوای په روه ردگار له به هه شـــتا به بێ كۆتایی و دوایی هـاتـــــن ، كردووه ی موسوڵمانێكێ ده ژمێرێت و به چه شنی پاداشت و كرێـــــــــی

کردەوەکان بە موسوڵمانانی شیاوی بەهەشت دەبەخشێت و دەگەیەنێت، دەبا جوتیارانمان لە کێڵگەکانیاندا وەک مزگەوت و پەرستگایەک تەمەنی پیرۆزو بەفەڕیان بەسەر بەرن..

ئێستاش ئێوەو هەردووباسە ئابووری-یەکە لە ڕووی بڕیار و پەیڕەوی فیقه لە بەشی (لائحه) ی کاری ڕۆژانەی جوتیارانماندا

یەکەم: زەوی کێڵی (المزارعة):
چاکترین چەشنی ئەم کارە ئەوەیە کە کارکەر (مزارع) بە ڕێگای (اجاره) واتە بەکرێگرتن لە خاوەن زەوی ڕێک بکەون، ئەو بەو شێوەیە کە هەردوو لایان لە بەرهەمدا هاوبەش بن. کە (بە داخەوە زۆربەی جوتیارانمان ئێستا وا دەکەن)، با جوتیارانمان ئەم شێوەی سەرەوە دەست بەرزن بکەن و بەم جۆرە زەوی یەکان لە خاوەن زەوی بەکرێ وەربگرن، جا ئیتر کرێی (إجارە) کە پارە بێ یان بەرهەم بێ. بە وێنە (٥) هەزار دینار یان (٥) تەن گەنم یان برنج یان پەموو. یاخود (١٠) فەردە توتن

کە ئاوەها دیاری بکرێت لە گەردنی (مزارع) دا بێ، نەک ڕێژەیەک لە بەرهەمی زەوی و کارەکە، ئەم چەشنە بە باشترین چەشن دەزانین لەگەڵ ڕای هەموو (فقهاء) کاندا پەسەندو ڕەوایە لە بەر ئەمانەی خوارەوە:

(١) زەوی کێڵگە یەک کە تۆوەکەش هەر لە (مزارع) ەوە بێت و هەردوو لا لە بەرهەمدا هاوبەش بن، لای کەلێ لە ئیمامانی فیقه دروست نییە، بەڵام ئەگەر تۆوەکە لە خاوەن زەوی یەوە بێت لە هەندێ بۆچوونی فیقهدا دروستە، کە ئەمیش پەسەند (اختیار) ی ئیمامی نەوەوی یە، کە زەوی و تۆو لە خاوەن زەوی یەوە بێت و کارو کۆشش لە (مزارع) ەوە بێت، ئالێرەدا ئەکرێ زەوی کێڵگە کە بە هاوبەشی لە بەرهەمی کاری زەوی یەکەدا بێت، جا بۆ ئەوەی لای هەموو ئیمامانی فیقه زەوی کێڵی یەکە دروست و ڕەوا بێت با بەو شێوەی سەرەوە ڕێک بکەون واتە بەچەشنی (إجارە) و بە کرێگرتن، ئیتر خاوەن زەوی مافی

به به رهه می زه وی یه که وه نه بێته
(٢) کارکه ره که له کاره که دا گورج و گۆڵ و لێبڕاو تر کار ده کات ، چونکه به رهه مه که هه موی بۆ خۆیه تی دیاره مرۆڤیش بۆ خۆی چاکتر و باشتر هه وڵده دات له وه ی که بۆ که سی تر بێت ، یان که سێکی به شداری بێت .
(٣) به رهه مه که له نێوان کارکه ر (مزارع) و خاوه ن زه ویدا هاوبه ش بێ ئه وا خاوه ن زه وی به شدار ده بێ له هه موو دانه دانه ی به رهه مه که دا مه گه ر بۆ خواردن یا به دیاری بردنی ته نها شتێک پرس به خاوه ن زه وی بکات ، چونکه هه ردوو لا یان له و یه ک شته دا به و ڕێژه یه ی که ڕێک که وتوون هاوبه شن ، بێگومان ئه مه یش وه ڕس بوون (ازعاج) ه بۆ هه ردوانیان ، که پێویست به گه ردن ئازایی ده کات و گه لێ جاریش ده بێته هۆی گله یی و بناشت ، چ له لایه ن خاوه ن زه وی (مالک) ، وه چ له لایه ن خاوه ن کار (مزارع) ه وه ، بۆیه له سه ر لاپه ره ی په یامی ڕاستی جوتیاران و خاوه ن زه وی یه کان ئاگادار ده که ینه وه تا هه رچی ده کرێت و ده توانن پێک هاتنیان له م بواره دا با به م شێوه یه بێ که باسمان کرد ، واته به پاره یان هه ر به رهه مێکی تر که له گه ردنی (مزارع) که دا بێت ، نه ک به به شێک له به رهه می کارکردن له زه وی یه که دا .
مه به ستی ئێمه ش له م باسه دا ڕاگه یاندن و به رچاو خستنی باشترین و په سه ند ترین کاری (زه وی کێڵی) یه ، چ له ڕووی فیقهه وه که (لائحه) ی کاری ڕۆژانه ی موسوڵمانانه له هه موو بارێکی ژیاندا ، وه چ له ڕووی باشترین ڕێکه وتن و پێک هاتنی دوو که س له کارێکدا .
ئیتر تا ئه ڵقه یه کی تر له م گۆشه دا بۆ لێدوانی لقی دووه می سه رباسه که باغ دێری (المساقاة) به خواتان ده سپێرین و هه رشادبن ...

---

سه رچاوه ی ئه م باسه په ڕاوه کانی فیقهه ، به تایبه تی (مغني المحتاج ج٢ ل٢٢٤) وه (شرح المنهج به حاشیه ی البجیرمي ج٣ ل ١٥٤) .

//////////////////////////
////////////////////
//////////

# پەیامی بانگخوازێک

ڕزگار هەڵەبجەیی

دەستتان بێنن بە میهرەوە
لەناو دووکەڵی دۆزەخی تەمەنێکا
دەرتان دێنم ..
بۆ جیهانێک .. ئاسوودەتر
دوور لە کڵپە و تینی ئاگر
گۆمی نەزانینی سەردەم
ئەشڵەقێنم ..
بۆ پرسگەی هەواڵی بوون ..
چرۆی بڕوام
بانگخوازێکی ڕێگەی خوام
چەند ڕووناکە ناخی دەروون ..
لەو ساتەوە ..
نیگا وێڵی ڕاستەقینەی ئاوێنەیەو،
لە کازیوەی ڕازی بوونا
خۆی ..دی‌یەوە ..
پشت لە تارمایی جێ‌هێشتووی
زەمانێکا
هەور ئاسا ڕەوینەوە ..
ئەوە منم .. منیش ئێوەم

نەورەسێکی نێو ئەو کێوەم ..
گیان لە گەشتە ،
نیگا خەونێکی بەهەشتە ..
وا لە کێشمەندی گڵەوە
دوور ئەگرێت و ،
بەرەو پەروەردگار ئەفڕێ ..
نیازخوازە
ژیانێکی بێ‌سنوور بکڕێ ..
جەستە .. ماندووی دەمی کاتە
لەناوەندی ئاهەنگی بوون ..
وا دەکەوێ ،
لە هاتوچوون ..
خوا ئەزانێ
کێڵگەی شینی دڵی بڕوا
چی بە سینە پیشان داوە .. ؟
ڕەنگدانەوەی بەندەگیی خوا
بانگی ڕەوا ..
کە دەبێتە خۆزگە و هیوا ؟

× × ×

ئه وه مـنم .. منیش ئێوه م ..
به ره و ئامانجم به ڕێـوه م ..
له مێژه وه ، زایله ی کاروانـی ڕێگه م
مـوسڵــمـانـم ..
پـسانــی کۆتــی ده ست و پێم
سروودی به کوڵی (به ننا) و ،
تیراسای دووڕپیانێکی ڕێـم ..
من ده مه وێ له م ڕاسته ڕێ یه
ئاشنـــابــم ..
ته نها به نده یه کی خوابـم ..
دڵه گه وره ی
بانگخوازێکی بێ په روابـم ..
دێم و ، له جێی ئه و ده نگانه ی که تاساون
ده نگێ ئـــه بــم ..
بۆ ناوه ندی کپ کراویان ،
ره نگێ ئه بـم ..
له گه ڵ سپێده ی ڕۆژی نوێ
تیشکی زێرین ، کامه رانـی ده هێنمه وه ..
هه وری سته م کۆچ پێ ده کـه م
تارمایـی ده ره وێنمه وه ..
تارمایی ده ره وێنمه وه ..

× × ×
× ×

محـمـد امـیـن احـمـد

- " ڕێکه .. بـرۆ ۆ.. زووکه .. خێراکه..
ڕاست برۆ ۆ.. نه‌که ویته خواره وه ..
کچه نه خلیسکێی !! ئه وێ لوغمه !! "
له ترپه‌ی ده نگی پێی ڕێره‌وه کـــان
زیاتر هیچی‌ترت نه‌ده‌بیســـت ،
مه گه‌ر جارجار قرشکێك یا ورتـــه
ورتێك له ناکاوا بێده نگیی ڕێگـــاو
بانی ده شکاند .. ماندوو و شه که‌ت،
مه نزڵ دوور و توێشه بـه‌ره کــم !!
دیمه نێك له ڕۆژی مه حشه‌ر.. قرت ،
قرت .. وه کو ڕۆبۆت[1] هه نگاویان‌ده‌نا،
په‌یکه‌ره کانیان به ناو قوڕو چلْپاو و
شوێنی‌خـز و لاریی‌لینج و قـوڕی مچی
پێلاوگر و پێلاودڕدا، ته کانیان پــێ
ئه‌دان و ده‌که وتنه پێـخاوسی..

له یه‌کێك له پێچه‌کانی (ئه‌زمڕ)دا
تۆف و زریان، گرمه و نالـــــه‌ی
بۆردومانیش له پێچه که‌ی‌تردا هه‌موو
به‌یه‌کدا هاتن..

- " ڕێکه ن .. برۆن .. مه وه ستن .. "
ده شت و ده‌ر وه کو ئێستا قـرِوقاتیی
له پۆ داماو و ڕه جاڵه کان ده‌رکـــای
له سه‌ر پشت بوو، به قه‌د و بـــالای
شاخه کاندا ده زنان .. هه ندێکیـــان
ده خزێنه خواره وه .سیزیف[2] ئاســا
ده غلانه وه .. چه ندیان ئاو برد نــی،

یا وه ک لێواری نانی ژێر ده ستی خوا پێداوه کان ره ق ده بوونه وه !! به لام که س له که س نه ده که وت ، کور و کیژ.. پیاو و ژن.. پیرو جوان.. له ژوورێکی ڕۆخاوی دلۆپاویدا ، ڕان له سه ر ڕان.. سه ر له سه ر کۆش، هه ناسه به هه ناسه وه.. به کتریان ده پاراست.. تورمه ی[3] پاک و نه ژادی ره سه ن ، ولاتی گیرساوه ی که شتی یه که ی ( نوح ) ، که تێیدا له نگه ری خستبێ، ده بێ خۆشه ویستی خواوه ند بێ..

جه ژنی قوربان بوو.. له(عه ره فه) (( اللهم لبیک)) بوو.. له عه ره فه ی کورده واریدا کۆچ و ره و.. ! ئه ی چ به لگه یه کی خواوه ندی گه وره و تاقیکردنه وه یه کی گه ردوونی بوو ! هه ریه که له و کۆچ و ره وانه ده یگوت: (( خواوه ند ئه م عه زابه مان له سه ر لابدات و بگه رێینه وه ، ده بێ کوردستان بکه ینه کۆماری ئه وین و، خۆشه ویستی.. گه ر جه رده ی تێدا هه لکه وت ، ئه وا هه لی ده واسین! ))

هه وره تریشقه و تۆفی باران و ره هێله و ته رزه ، گوناهی ده شته وه..

- " بۆ کوێ ده ڕۆین ؟ " .. " بۆ کێی به جێ ده هێلن ؟! " ولاتی خۆتانه ، به جێی مه هێلن ! " .. که له ژێر ڕمی دوژمن دوور که وتنه وه ، هه ر یه که بۆ خۆی ده دوا..

- " بابه برسیمه " ..

- " باشه ، ئه وا گه یشتین " ..

جگه رگۆشه کان له برسانا ، ره ق ره قتر ده بوونه وه.. به کراسه مه یبیوه که ی به ریان ده نێژران !! پیره ژنی پشت چه ماوه ش له قه د پالی چیاکاندا ده هاتنه ناشتن.. ده یان نه وجوان و جوامێریان له قه د پال و له سه ر پال و له پال ده می چیاکان و له ناو ده شت و دۆلدا گیانیان پێشوازیی له کۆره وه که ده کرد.. یا به شه و ڕێنوێنیی ره جاله کانیان ده کرد..

دایکی گوتی :

- " به جێم مه هێلن منیش دێم.. "

له ولاشه وه کۆره وه هه رزه کاره که کۆرانیی (( به ته نیا جێم مه هێلن ، ئه م شه و زریان ده مچێنێ ! )) ی خستبووه سه ر..

پیارسکه که ی کۆلێ و بۆله بۆلی خێزانه که ی و گریانی مناله که ی و شه خته باری ڕێگا ، ئاواته ژاکاوه کانی و

ڕۆح شیرینی دایکی و تـرس و ڕۆح
شیرینی،سه یری پیری و جوانی ناکات !
لای لێ کرده وه : ـ منداڵه کـــه م
به جێ بهێڵم ، تۆ به جێ ناهێڵــم
خه مت نه بێ !!
کۆڵه که ی له شانی داگرت و خستیه
سه رشانی خێزانه که ی . خـــۆی
دانواند ، دایکی گرت به کۆڵه وه ..
له م هه وراز ، بۆ ئه و هـــه وراز ،
دایکی هه ر به کۆڵیه وه بوو .. نـۆ
مانگ و نۆ ڕۆژ، به پێستی سکێ ئه می
هه ڵ گرتبو ، هه ر چه ند ، له و ڕۆژه
زاری یه دا[٤] ، به کۆڵ بیگێرێ ، هێشتا
پاداشتی ئه و دایکه نادرێته وه ...
چی هه بێ له دایکێ پیرۆزتر بێ ! ...
مه گه ر باوه ری قایم به خواوه ند..
ـ بابه به جێم دێڵـی !!
ئه و منداڵه ده ست و قاچ تـه زیـوه ،
وورده ، وورده ، هه نگاوی ده نا ، له و
ڕۆژه زوقمباره دا . سه ر لووتی سوور
سوور هه ڵگه ڕابوو، چاوه کـانـــی
ده برسکایه وه ، له گه ڵ ، هـــه ر
سه یرکردنێکیا ، ده یان پرسیاری لێ
ده ته کێن ! لای لێ کرده وه ، خه مه کانی
مه ییبون :
ـ نه خێر .. چۆنت به جێ دێڵم .ئه وه
نیـه ، ده ستت ، به ده ستمه وه یه..
ـ ئه مه چیت ده بێ ؟!
ـ کوره زامه .. ئه و ڕوژه ره شه ، له م
ڕۆ ، سه ختر بوو ! ئای له و ڕوژه ش
ئه م کوره زا ه م ، له هه ڵه بجـــه ی
شه هیدا ، ڕزگار کرد ؟! ئێستـاش ،
ماکی کیمیا بارانه که ی هه ڵه بجـه ،
پێش چاوم لێڵ ده کا !
ـ خۆشـم .. بـاوکێ ، له مناڵه کانـــی
دابرا .. دایکێ له ناو ئازاره کانیـا
ده بـژا ، برا به ده م ژانه وه ، ده تلایه وه
سه ر ده رکه ر ماڵ پرسیاری نیـه ، ئـا
له و گه رمیانه دا ئه نفال کرابـــن و
گشتمان ، به سه ر په تی و "پا" په تی
ته یاره ش به سه رمانه وه ...
زه وی خز ، ڕێگا ئاونگ و ته مـاوی ،
له پـڕ ده یکرد ه باران و تـــۆف و
ره هێڵه ، به ئاخ و ئۆف ، گه یشتـــه
لایـان :
ـ دێ بیته وه ؟!
ـ کچێ گه رام ، زۆریش گه رام ، پرسیم ،
له ئه م ، له ئه و خۆ ده ستـی بـــه
ده ستمه وه بوو .. چۆن لێم ترازا ؟!
تلۆقی سه ر په نمچه کانی پێـــــی
ته قیبوو نه وه ، کاوه کاوییان بوو[٥] ...
( مه ریخ ) یش ، جه به خـانـــه ی

بارووودی لە خۆی دابوو ، کۆشکی سپیش ، کە وتوبوە هەڵدانی پێکی سەرکەوتن ، کۆشکی تێکشکاویش ، کە وتوبوە ، ڕاوە کورد . بۆیە دەتبینی ئەو ڕێگاو بانانە ، وەکو گوڵە فەرش ، خەڵکی بە پیادەیی بە ماشین ، تا بەنزینی تیابوایە ڕێچەکەیان دەبەست ... بارانیش پۆلێک ، پۆلێک ، بەجەستە باندا دەهاتە خوارێ .

( تەرزە ، باران ، تۆف ، لافاو ، سەرما ، ڕچین ، ترس ، مردن ملوغم کیمیاباران . کۆچ و ڕەو . تەیها) (٦) مەگەر نەتبینی !

ـ ئەو ئافرەتە دوو سێ منالی سەرو پێچکەی دابوە پێش خۆی !

ئەوەی تەنیشتم ، ترانسستۆرێکی سووتابوو . جار جار دەبچیرکاند :

-(( بەم دەم و دەستە یا ڕپە یدا نابێی ... یار پە یدا نابێ ) ! !

ـ (( چە ژنی قوربانە ، مەوسمی ئازادیە ! ))

ـ (( کوشتن و برین ، کۆچ و ڕەو ، عەرەفەی ، کوردە واریە ! ))

بۆ یەکتریان دەسەندەوە ! تادرەنگێک ئەوشەوە خەویان لە

چاو شەتەکان ڕفاندبوو .. خەو نەمابوو . وەنەوز بردن ! ڕێگاو بان ، تووڵە ڕێگای پێچاو پێچی ناو شاخەکان ، هەنگاوی مێرووولانەی خەڵکی و لاپەڕەکانی تەسەنی مێژووی جیاکان هەڵدەدایەوە . .

ڕستەکان ، ووشەکان ، ئاخ و ئۆف و هەناسەکان ، بروسکانە ، بە مێشکیانا تێدەپەڕی . باڵی خستە ژێر سەری کوڕە زاکەی بەپەتویەکی تەڕ خۆیانیان داپۆشی یەوە .

منداڵەکەش ، دەستە چکۆلەکەی نوقاند بوو . بەسەر چاوە گەشە ڕیپۆقاویکە یدا گرتبو . دەیگوت و هەر دەیوتەوە :

ـ (( بابە ! سبەینێ بەجێم نەهێڵیت !))

ـ (( جارێکی تر ، خاک ، بەجێ ناهێڵین!))

خەو بردیانەوە . بۆ بەیانیەکەی هەر لەو شوێنەدا . مەرقەدیان بۆ هەڵبەسترا . .

پەراوێزەکان :

(١) ڕۆبۆت : مرۆی لە ئامێردروستکراو .

(٢) سیزیف : هێمای عەزابە ..

(٣) تورمە : لەسل ـ سولالە ـ نوتفە ..

(٤) ڕۆژی زاری : ڕۆژێکە مرۆی دڵتەنگ و سروشتی خۆلاوی دەگرێتەوە ..

(٥) ئازارێکی مێژوجانیە ..

(٦) تەیها : ئیشارەتە بۆ (التیه)کەی موسا پێغەمبەر(س.خ)..

(١) ڕۆژی ١٩٩٣/١٠/١٢ ناوچەی سلێمانیی سەر بە (کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامیی کوردستان) لە سەر هۆڵی قوتابخانەی سورکێو پێشانگایەکی هونەریی شێوەکاریی بۆ هونەرمەندی لاو کاک (ڕەجا محمد علی - سەرباز) کردەوە .. شایانی باسە پێشانگاکە - کە (١٠) ڕۆژی خایاند - لە (٦٣) تابلۆی هەمەجۆر لەسەر تەرزێکی نوێ کێشرابوون و ، هونەرمەند بەقەڵەمی جاف زۆر دەست ڕەنگینانە لە هەر تابلۆیەکدا چەند دیمەن و ڕووداوی کۆ کردبووەوە .. تابلۆکان لە ئازار و ئەشکەنجە و ئەندێشەی مرۆڤی کورد دەدوان ، بانگەشەیان تێدابوو بۆ گەڕانەوە بەرەو ڕەسەنایەتیی ئیسلام و دەستە و دامێن بوونی ڕۆشنفیکرانی گەلەکەمان بۆ وەلامدانەوەی بانگی خواوەند .. هەروەها چەند دیمەنێکی تری لە ئامێز گرتبوو .

لە بارەی پێشانگاکەی کاک (سەرباز) ەوە چەند هونەرمەندوئەدیبێک وتەی خۆیان ئاراستەی هونەرمەند کرد :

**- بەڕێز مامۆستا عەلی جۆلا :** ((بەڕاستی کارەکانی کاک ڕەجا بەهێزن و جۆرێک ئازایەتی و جورئەتی تێدایە ، بەتایبەت لە سونگەی دەربڕینی فیکرەکانیەوە .. بەلام من لەگەڵ ئەوەدا نیم هەر تابلۆیەک چەندیمەنێکی واچڕ و پڕی تێدا کۆ ببێتەوە .. )) .

**- بەڕێز مامۆستا ڕەئوف حەسەن :** ((زۆر بەڕێزەوە من سەیری کارەکانی کاکە (سەرباز) دەکەم .. بەڕاستی زۆر سەلیقەدارانە قەڵەمی جافی بەکار هێناوە، لە هەمان کاتدا ئاواتەخوازم کە خەڵکی هونەردۆستی ئەم شارە خۆیان لە بڕیاری دەروونیی ڕزگار بکردایە و سەریان لەم نمایشگایە بدایە ..

ئومێدەوارم کاکێ(سەرباز)یش دەرفەتی زیاتری ببوایە بۆ ئەوەی لە هەر تابلۆیەکدا یەکێ فیکرە بنەخشێنێت هەتا دەرەتانی بیرکردنەوە لە بینەری کارەکان نەبڕێ))..

ــ بەڕێز کاکێ مەولود باوەمراد : ((برای بەڕێز کاکێ ڕەجا لەم کارە هونەرییەیدا چەند چوارچێوەیەکی بڕیوە و چەند چمکێکی گرێداوە .. ئەو چوارچێوانەی کە بڕیونی ئەوەیە کە لە شارەکەی خۆیەوە ـ شاری مەرگەسات ـ دەست پێدەکات و ، پاشان بە ئازار و ئەشکەنجەیگەلەکەی لە ئەنفال و ڕاگوێزان و ، پاشان گەلانی موسڵمانی دونیا لە بۆسنە و ئەفریقیا و کشمیر و ، پاشان ئازاری مرۆڤایەتی سەرجەم لە جۆرەها دەرد و نەهامەتیدا. وە ئەو چمکانەی کە گرێیان دەدات پێکەوە بەستنەوەی ڕا و بۆچوونی سەحوەی ئیسلامی گەلانی جیهانی ئیسلامییە ، کە هەمووی لە بۆتەی کار بۆ بەندایەتیی ڕاستەقینە و بەرپابوونی حاکمیەتی ئیسلامدا دەتوێتەوە .. ئەوەش لە تابلۆکانی : (نوور و پەیامەکان) ، (کاکێ ئەحمەدی موفتی زادە) ، (شەهید ناصر) ، (سەییدی شەهید) ، (ئەبولئەعلای مەودودی) و (پێشەوای شەهید) دا بەڕوونی دیارن .. ئەمە ئەو دیاردە ئاشکرایە بوو کە توانیم سەرنجی بدەم ، بەڵام تێکڕای تابلۆکانی سەرکەوتوون و توانیویەتی تابلۆکان بێنێتە گۆ.

ــ بەڕێز کاکێ سالم الحجی : ((سەیرکەر بەڕاستی سەری سوڕ دەمێنێ کاتێ سەرنج دەداتە ئەو جیهانە فراوانەی فیکری کاکە (ڕەجا) ی لێوە دەردەچێ .. ئەگەر پێشانگاکانی ساڵی(١٩٨٩) ی کاکێ ڕەجا سەرەتا بووبن ئەوا ئەم پێشانگایە چەندەها هەنگاوی گەورەی ناوە بەرەو پێش چوون .. من ڕام وایە ئەم تابلۆیانە تەعبیر لە سەر کێشەی سیاسی و فیکری دەکەن و زمانی حاڵیان و تەقلیدی نییە .. لە لایەنی هونەرییەوە چالاکانە قەڵەمی جافی بەکار هێناوە، لە دەربڕینی فیکرەکاندا قاڵبی لاسایی سروشتی بڕیوەو بڕێکی زۆر سوودی لە قوتابخانەی(تەجریبیەت) و جیهانە تەڵخەکەی وەرگرتووە .. بەڵام تێبینیی ئەوەشم هەیە خۆزگە برای هونەرمەند ئەو

نووسینانەی لە ژێر تابلۆکاندا لادەبرد، ڕاستە تەعبیرەکان ناسک و جوانن، بەڵام پێویستە تابلۆکان بەزمانی هونەر خۆیان بۆ سەرکەر بدوێن..
لەلایەکی تریشەوە هەندێ لە پۆستەرەکان زۆر ئاشکران و پێویستیان بە ڕوونکردنەوە نییە.. من پێم وایە کۆکردنەوەی ڕووداوەکان لە یەک پۆستەردا شتێکی زۆر ئیجابییە و هێزێکی بە پۆستەرەکان بەخشیوە، چونکە ڕووداوەکانی هەر پۆستەرێ لە سەر یەک میحوەر دەڕۆن.. لە کۆتاییدا دەست دەخەمە نێو دەستی هونەرمەند کاک ڕەجا و، پڕ بە دڵ بە ئومێدی بنیاتنانی هونەرێکی ئیسلامیی ڕەسەن پیرۆزبایی لێدەکەم..)).
(١) هەروەها ڕۆژی ١٩٩٣/١١/١١ لە سەر هەمان هۆڵی ناوبراو لیژنەی ئافرەتانی سەربە (کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامیی کوردستان) پێشانگایەکی (ئیشی دەست) یان کردەوە و (٧) ڕۆژی خایاند.. کارەکان بریتی بوون لە خۆشنووسی و هونەری شێوەکار بە(٣٥) تابلۆ، بابەتی فۆلکلۆریی کوردەواری، چنین و ڕستنی شتی هاوچەرخ، ئیشی سیرامیک (٥) پارچە، چەندەها پارچەی گوڵ و ئیشی دەست..)، بەڕاستی پێشانگاکە کارێکی سەرکەوتووانەی لیژنەی ئافرەتانی سەر بە کۆمەڵە بوو.. ژمارەیەکی زۆر لە هونەرمەند و هونەردۆستانی شار سەردانیان کرد و، ڕاو بۆچوونی جیاجیای خۆیان لەسەر دەربڕی..

ئامادەکردنی
لیژنەی هونەر

وێنەی یەکێک لە تابلۆکانی پێشانگاکەی هونەرمەند کاک ڕەجا

ooooooooooooooo

## یادی نۆزدەیەمینساڵڕۆژی

## کۆچی دوایی

## مامۆستای شاعیرو خواناس

شکرایە کە ناوچەی شارەزوور لە دێرین زەمانەوە مەڵبەندی چەندین زاناو ئەدیب و خواناس بووەو، زنجیرەی پیاوانی هەڵکەوتووی هەمیشە پەیوەست و نەپساو بووە..

هەر لە چەرخی زێڕینی چوارەم و پێنجەمی زایینییەوە دەنگی ناوازەی (زانایانی شارەزووری) کە وتە گوێی هەموو ناوچەکانی تری جیهانی ئیسلام، بە تایبەتی ناوەندە زانستیی و ئەدەبییەکان، بۆیە نازناوی (القضاة الشهزوريون) بوەتە زاراوەی فەرهەنگەکان و ناوی کتێب و بیبلۆگرافیای تایبەت بە زانایانی شارەزوور..

ڕاستە کە زاراوەی (شارەزوور) لە و سەردەمەدا ناوچەکانی هەولێر تا نزیکی (هەمەدان) ی ئێرانی گرتۆتەوە، بەڵام لەڕاستیدا ناوچەی شارەزووری ئێستاش کە دەکەوێتە نێوان شاری سلێمانی و هەڵەبجەو هەورامان سەدان زانای پایە بەرزی تێدا هەڵکەوتووەو لە لیستی زانایانی شارەزووری دا بەشی شێرانەی بردووە.

یەکێ لەو پیاوە ناودارانەی سەردەمی نوێی ئەو ناوچەیە شاعیری خواناس مامۆستا (شێخ ئیبراهیمی بانی بنۆکی ـ شانەدەری)یە.

* مامۆستا ئیبراهیم - کەکوڕی مامۆستا شێخ مەجیدی شانەدەری‌یە. لە ساڵی ۱۹۳۰ دا لە دێی(بانی بنۆکێ) ی بناری شارەزوور سەر بە ناحیەی (سید صادق) چاوی بە دنیا هەڵهیناوە ..

* هەر لە منداڵی‌یەوە لە نێو خێزانێکی ئایین پەروەردا چاوی کردۆتەوە .. باوکی کە پێش نوێژ و وتاربێژی مزگەوتی شانەدەری بووە لە پەروەردەکردن و تێگەیاندنی مامۆستادا دەورێکی کاریگەری هەبووە. لەگەڵ ئەوەدا کە پۆلی شەشەمی ئەوکاتە دەخوێنێ، دەرسی زانستە شەرعی‌یەکانیش لای باوکی وەردەگرێت و ، ناوبانگی زیرەکی و لێهاتوویی بڵاودەبێتەوە ..

* مامۆستا هەر لەسەرەتای لاوی‌یەوە خوودەداتە ئەدەب و دەست دەکات بە شیعر نووسین و وەکو هەموو شاعیرە ناودارەکانی کوردستان بیروباوەڕی ئیسلامیی دەکاتە هەوێنی شیعرەکانی و نازناوی (ئازاد) بۆخۆی دادەنێ .. بۆیە پەیمان دەدات کە لەگەڵ بڕوادارانداا بێت و خۆی بخاتە کاروانی بێدار بوو و ڕاپەڕیوی ئەو سەردەمە ، کە تازە خەریکێ بوو جموجووڵی ئیسلامیی نوێ سەری هەڵدەدا .. ئەوەتا بە ئاشکرا هۆگریی خۆی بۆ ئیسلام و پەیمان بردنە سەری دەردەخا و بێ پەردە دەڵێ :

بە قسە و داوی شەیتانی ئەمن (قطعا) فریب ناخۆم
کراسم دینی ئیسلامە هەتا ئەمرم لەبەرمایە
ناچمە دەر من لە عەهد و قەول و پەیمانی ڕەفیقان
لە بۆ ئەو عەهدە تاجێکە بە فەخرو من لەسەرمایە .

* مامۆستا لە ژیانیدا حەزی نەکردووە بێکار بێت و بەتەمای خەڵکی بێت .. بۆیە هەمیشە کاری کردووە و لە زەوی و زاری باوکیدا جوتیاریی کردۆتە پیشە ..

* لە ساڵی ۱۹٤۹ دا دەبێتە کارمەندی دائرەی (ئابار) و لە ساڵی ۱۹۵۰ دا ژنی‌یەکەمی هێناوە کە ئەختەرخانی کچی مەلا قادری سید صادقی‌یە و ، دواتر ژنی دووەمی هێناوە کە عائشەخانی کچی شێخ

حاميدى جوّمه ره سى يه .. ئيّستا چواركورِ و ده كچى ماون..

* له سه ره تاى شه سته كاندا ده بيّته ماموّستا و پاشان په يمانگاى ئيسلامى ته واو ده كاو ده بيّته مه لاى ره سمى و نه قلّى ( سوق الشيوخ ) ده كريّ .. پاش ماوه يه كىٔ ده گه ريّته وه بوّ مزگه وتى شانه ده رى و دواتر ده چيّته مزگه وتى هه لاجه كان له شارى سليّمانى.

**له گه لّ كاروانى بيّداران دا :**

* وه كىٔ وتمان ماموّستا گوّشكراوى قورئان بوو ، بوّيه به گه رمى تامه زروّى بزاڤيّكى ئيسلامى بوو كه هه ولّى گيّرانه وه ى كيانى ئيسلامى بدات و ، روّلّه كانى گه له هه ژاره كه ى بيّداربكاته وه ..

له م بواره دا كاتيّ كه شه مالّى ئه و بيّدارى يه گه يشته كوردستان، ماموّستاش خوّى هاويشته ئه و كاروانه و ، بووه دوّستيّكى گيانى به گيانيى ماموّستا شيّخ عه زيزى پاره زانى كه يه كيّكىٔ بوو له پيّش قه تاره كانى ئه و كاروانه ..

هه ر له به ر ئه وه ش بووماموّستا شيّخ ئيبراهيم يه كيّ له و ماموّستا ده گمه ن و كه م ويّنانه بوو كه كتيّبخانه كه ى به نووسراوى پياوانى مه حوه ى ئيسلاميى نوىٔ - وه كىٔ حسن البنا و سيد قطب و ابو الاعلى المودودى و ...هتد - رازاندبووه وه ..

به م پيّيه ماموّستا ئيبراهيم وه كىٔ سه ربازيّكى سه نگه رى داكوّكى له ئيسلام و حه قبيّژيّكى سه كوّى ئيسلام ناساندن ده ستى كرده كارو به وتار و شيعر و كوّرى تايبه تى له گه لّ دوّستانى چووه مه يدانى خزمه ت كردن به ئاييني خوا و موسلّمانان ..

هه ر له روانگه ى هه ست به به رپرسيارى و خه مخوّرى يه وه بوو كه له سالّى ١٩٧٣ دا بووه سكرتيّرى يه كيّتيى زانايانى ئيسلاميى كوردستان بوّ ناوچه ى شاره زوور.. دياره هه لّبژاردنى ئه و له لايه ن ماموّستايانه وه ماناى نرخ پيّدان و ريّزى كه سايه تيى ماموّستاى به ريّز بوو ..

**له گه لّ شيعر و شاعيراندا :**

وه كىٔ وتمان ماموّستا هه ر له

سەرەتای لاوی یەوە زەوقی شیعری
بووە و ، هاوڕێیی هەندێ لە
شاعیرانی کردووە و ئالوگۆڕی
شیعریی لەتەکیاندا کردووە ..
قانیعی شاعیر ، یەکێ لە
هاوچەرخەکانی ماموٚستایە و
شیعری بۆ ناردووە و ئەمیش
وەلامی داوەتەوە .. یەکێ لەو
شیعرانەی کە قانیع بۆ ماموٚستای
ناردووە و ، تیایدا وەسفێکی زۆری
ماموٚستا ئیبراهیمی تێدا دەکات و،
دەڵێت :

بۆ فەیلەسوفی عەسری بیستەمین
ئەولادی حەضرەت محمد امین
غەوواصی بەحری عیلم و مەعریفەت
گوشادکوننەدەی موشکیلاتی سەخت
چابوکی سواری عەرصەی فەصاحەت
بالداری هەواری صاف و بەلاغەت
ماموٚستای غەزەل، هەم نوکتەزانی
خەلاتکراوی زاتی ڕەحمانی
خاوەن هونەر و تاجی قانیعی
مەشهور و دارای وەضعی جامیعی
........ تا دوایی .

یەکێ لە شیعرە نایابەکانی
ماموٚستا شێخ ئیبراهیم کە نزیکەی
بیست ساڵە بوەتە سروودی سەر

زاری منداڵان ، گۆشبووی خێزانە
ئیسلامییەکان .. ئەم پارچە شیعرە
بەناوبانگەی خوارەوەیە ـ کە
بەداخەوە زۆربەی شیعردۆستانیش
نازانن هی ئەوە و، چەند شاعیرێک
( تەخمیس ) یان کردووە و ئاماژەشیان
بۆ ناوی ماموٚستا نەکردووە ـ ..
لەم سروودەدا کە بۆ منداڵانی
بێداریی وتووە ، دەڵێ :

من ڕۆڵەی موسڵمانم
خاوەن دین و ئیمانم
باوەڕم زۆر بەتینە
بەم خوای سەما و زەمینە
موحەممەد پێغەمبەرمە
فەرموودەی تاجی سەرمە
قورئانە پێشەوامە
تا دنیا بەردەوامە
نوێژ و ڕۆژوو چرامە
موسڵمان گشت برامە
هەرچەند ئەمرۆ منداڵم
تەمەن هەشت نۆ دە ساڵم
بە ناز بەخێو کراوم
ئیسلامە نووری چاوم
ئەگەر بیری بدەینێ
ئێمە ین پیاوی سبەینێ

منم یارو کوٚەکی
هەڵگری ئالاّ و چەکی
سەرباز ی ڕێگەی دینم
هەتا دواکاتی ژینم .

لەڕاستیدا لە شیعرەکانی ماموٚستادا سوٚزی ئیمانداری و گەرمیی قەناعەت بەبەشی خوا و تینی دڵسوٚزیی دیارە .. لەپارچە شیعرێکی نایابیدا ئەم چەند کوٚپلە یەمان هەڵبژارد، کە دەڵێ :

هەرچەندە عەبدێکی عاصی و پر
گوناه و خوارە ڕێم
عاجز و بێدەستەڵاتم، پێ لە
ڕاستیی خوٚم ئەنێم
زوٚر بەرەحمە خوا لەگەڵما ، بوٚیە
زیاتر چاوەڕێم
بوٚیە بێ ئارامە گیانم، ڕوٚژ و شەو
دایم ئەڵێم
صەد شوکر(الحمد لله) بوٚ بەشێ
خوا داویە پێم
تاکو ئێستا پێ بزانم بوٚتەماع
ڕیسوا نەبووم
بوٚ خراپە یا خیانەت ماڵی
هیچ کەسێ نەچووم
هەم لە بوٚ دنیا و پارەتن
نەمتکاندووە ئابڕووم
وا لە خوٚشیانا ئەڵێم من گشت شەوێ
ئەنجا ئەنووم
صەد شوکر (الحمد لله) بوٚ بەشێ
خوا داویە پێم ..

شایانی باسە ماموٚستا شیعری زوٚری وتووە و ، بەهوٚی باری پر چەکمەسەریی کوردستان و دەربەدەری یەوە زوٚربەی شیعرەکانی بوونەتە بەشی سووتان و تیاچوون، هەرچەند خوٚشبەختانە ژمارەیەکی زوٚر شیعری ماوە و ، لەلای یەکێک لە کورەکانی چاومان بەدوو دەفتەری شیعری کەوت ، کەدەیان پارچە شیعری نایاب و نیائەنگێویان تێدایە و ، شایانن چاوانی ئەدەب دوٚستانیان پێ بخەملێ.. ئەمەش هەنگاو کارێکە کە ڕوو دەنێ لە هیممەتی شاعیر و ئەدەب دوٚستان و ڕوٚشنبیرانی کورد کە مافی خوٚی بدەنێ و ، بەشداریی ئەرکی خستنە بەر دەستی ئەو شیعرانە بکەن ، چ بەلێکوٚڵینەوە و پیاچوونەوە بێت، چ بەیارمەتی و هاوکاریی چاپ کردنیان بێت ..

ماموٚستا شێخ ئیبراهیم
هەرچەندە تەمەنێکی کورتی

هەبوو و ، نەکەیشتە (٥٠) سـال بەلام ژیانێکی پڕ بەهرە و پڕ خزمەتی بردە سەر و جێگەدەست و کاریگەریی کاری لەناوچەی شارەزووردا بەجێهێشت و، توانی لەو تەمەنە کەمەدا سوود لە ژیان وەرگرێت و بەتفاقێکی زۆرە وە ماڵئاوایی لە دۆستانی بکات ..

ئەم شاعیرە خواناسە لە ١٩٧٥/١١/٢٥ دا پاش نەخۆشییەکی چەند ڕۆژە لە خەستەخانەی سلێمانی کۆچی دوایی کرد و، لە جێی سامان و دارایی دنیا تفاقێکی زۆری پەروەردەیی و ژمارە حیسابێکی ( حسنات جاریە ) ی کراوە و دانە خراوی بەجێهێشت ، خوا لێی خۆش بێ و بەبەهەشت شادی بکات و ، دیوانە نایابەکەشی بخاتە بەردەستی ئەدەب دۆستان ..

لە کۆتاییدا سوپاسی هەندێ لە کورەکانی مامۆستا و دۆستانی تر دەکەین کە لە بواری ژیانی مامۆستادا چەند زانیارییەکیان داینێ ..

## هەواڵێکی ئەدەبی

### یەکەمین پێشبڕکێی رابطەی ئەدەبیی ئیسلامیی جیهانی

چەند مانگێک لەمەوبەر رابطەی ئەدەبیی ئیسلامیی جیهانی ڕایگەیاند کە پێشبڕکێیەکی ئەدەبیی تایبەت بە ڕۆمان و کورتە چیرۆک ساز دەکات بۆ چیرۆکنووسان لە هەرکوێ بن .. پاش ڕاگەیاندنە کە ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیبان بەچەندین چیرۆک و ڕۆمان بەشداریان کرد ..

شایانی باسە لە هەڵسەنگاندنی بەرهەمەکاندا ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیب و ڕەخنەگر دەست بەکاربوون و سەرەنجام خەڵاتی یەکەم لە ڕۆماندا درا بە ( جهاد الرجبي ) کە ڕۆمانێکی بەناوی ( لَن أموتَ سُدى - بێهوودە نامرم ) نووسیبوو ، خەڵاتەکە بریتیی بوو لە (٢٠٠٠) دۆلار .. هەروەها پلەی یەکەمی چیرۆکیش بووە بەشی ( احمد مبارک ) ، کە چیرۆکی ( بودە لەرزە ) ی نووسیبوو..

جێگری سەرۆکی ئە و رابطەیە ڕایگەیاند کە بەرهەمە سەرکەوتووەکان لە ڕیزی چاپکراوەکاندا بڵاو دەکرێنەوە و لە ئاهەنگێکی فراواندا خەڵاتەکان دابەش دەکرێن .

لە گۆڤاری (الاصلاح)/ژمارە ٢٤٦

ئازاد قەزاز

جوانی حەزێکە خولیای سەری گشت مرۆڤێکە ، لە نزمترین پلەوە تا بەرزترین پلەی هۆشمەندی هەریەکە وبەگوێرەی توانا و لێهاتوویی خۆی خەریکە .. ئەم بوونەوەرەش جوانیی تیایدا قوڵپ دەدات وەکو ئاوێنە تیایدا دەدرەوشێتەوە ، هەمیشە زرمەی لەناو دڵی زانایاندا هەڵساندووە و شەیدای کردوون و بزواندوونی، بۆ دەکۆڵنەوە ، شەونخوونیی بۆ دەکێشن ، لەبەرچی خۆ ماندوو دەکەن ؟! شەیدای جوانیین ، جوانیی بوونەوەر حەپەساندوونی و سەرسام بوون .. شەوق و تاسەی جوانیی خۆشیی ژیانی پێ بەخشیون ..

بەڵێ جوانیی بوونەوەرە سەرنجی زانایانی بوونەوەرناسی و گەردوون ناسیی ڕاکێشاوە ، تا لێی تێ بگەن و ئەو حەزو ئارەزووەیان دامرکێتەوە و تاسەیان بشکێت .. واتە زانا عاشقە و زانست وەسیلەی گەیشتنە بە عەشق ..

(( لویس دی برویلی) ی فیزیازان

دەڵێ: ((لە گشت چەرخێکی مێژووی زانستدا هەستی جوانی هەمیشە دەلیلی توێژینەوەی زانایان بووە)).

بەڵێ، جوانی لەسەدەی بیستەمدا گەیشتە رادەیەک بووە گرنگترین پێوەری حەقیقەتی زانستی..

(ریچارد فینمان) دەڵێ: ((خەڵکی بەهۆی جوانی و سادەیی (الجمال و البساطة) ەوە هەمیشە دەتوانن حەقیقەت دەرخەن))..

هەروەها (هایزنبێرگ) ئەوەی ئاشکرا کرد کە ((لە زانستی وردەکاری و هونەردا شانبەشانی یەک جوانی گرنگترین سەرچاوەی رووناک کردنەوە و روون کردنەوەیە)).

فیزیا زانانی ئەم چەرخە لەئەنجامی جوانخوازی یاندا دۆزینەوەی زۆریان بەدەست هانی.. (هایزنبێرگ) سەبارەت بە (کوانتەم میکانیک - میکانیک الکم) دەڵێ: ((ئەم بیردۆزە زۆر زوو سەلمێنرا، چونکە بیردۆزێکە بەهۆی تەواوی و جوانیی تەجریدی یەوە زوو قایلت دەکات)).

زانایانی فیزیا وا دادەنێن کە بیردۆزیی گوێرەیی گشتی (النسبة العامة) سەرتاپا لەناو گشت بیردۆزەکانی تردا جوانترین بیردۆزی فیزیایی یە..

(شدۆرنگر) دەڵێ: ((بیردۆزە سەرسورهێنەرەکەی (ئەنیشتاین) لەبارەی کێش کردنەوە، بۆ بلیمەت و هەستناسک و جوانناس و سادەبیر نەبێت بۆ کەسی تر ئاشکرا نابێت))..

دیسانەوە (ئەنیشتاین) خۆی دەڵێ: ((هەرکەس لەم بیردۆزە - واتە (گوێرەیی) - تێبگات، وەک سیحر سەرسامی دەکات))..

بەڵێ ئەم جوانی یەی بوونەوەر جوانی یەکی مەوزووعی یە، هەڵقوڵاوی بیر و بۆچوونی زانانی یە.. واتە جوانیی زاتیی نی یە.. جوانیی زاتی ئەو جوانی یە یە کە کەسێک خۆی هەستی پێدەکات بەرانبەر شتێک، مەرج نی یە کەسانی تر ئەو جوانی یە هەست پێ بکەن.. بەڵام جوانیی مەوزووعی بریتی یە لە چەند پێوەرێک بۆ گشت کەس ئاشکرایە، بۆ نموونە کە دەڵێین بوونەوەر جوانە، چونکە

چەند سیفەتێکی تێدا دەدرەوشێتەوە مەرجن بۆ جوانکردنی ، ئەوانیش :

(١) سادەیی (البساطة) ..

(٢) هاوڕێکی (التناسق) ..

(٣) چوونیەکی (التناسب) ..

(٤) هاویەکی (التماثل) ..

(٥) هاوچەشنی (التجانس) ..

(٦) هاوتایی (التناظر) ..

(٧) قەشەنگی (الروعة) ..

جارێک (هایزنبێرگ) لە گەڵ (ئەنیشتاین) لە وتوویژێکدا پێی وت : (( باوەڕم وەک تۆ وایە سادەیی و جوانی یاساکانی سروشت سیفەتێکی مەوزوعیا هەیە ، بەتەنها ئەنجامی بیرکردنەوە نییە ، هەر کاتێکیش سروشت بەرەو داڕشتنێکی بیرکاریانە " صیغة ریاضیة " ملن بەرێت سادەیی و جوانیەکی مەزنی ئەوتۆی تێدا دەدرەوشێتەوە ، ناتوانین باوەڕ بە و حەقیقەتە نەکەین )) .

"هێنری بوانکاریە" دەڵێ : (( زانا لە سروشت ناکۆڵێتەوە چونکە سوود بەخشە ، بۆیە دەکۆڵێتەوە ، چونکە خۆش بەخشە ، بۆیە ئەوە و خۆشە دەبەخشێت چونکە جوان بەخشە جا ئەگەر سروشت جوان نەبوایە شایستەی ناسین نەدەبوو )) .

واتە بوونەوەر هونەرێکی جوان و ناسک و چونیەک و هاویەک و هاوچەشن و گونجاو تەباو قەشەنگ و سەرنج ڕاکێشەرە ، تابلۆیەکی هونەری ئێجگار مەزنە ، خەریکین هەر لە ڕێگەی ئەم زانستەوە دەگەینە ئەوەی بزانین ئەمە هونەرە ئەی هونەرمەندەکەی کوا ؟ ئاخو چۆن بێت ؟ چ زاتێک بێت ؟.. چ فلچە و بۆیەیەکی بەکار هێنا بێت . کێیە ؟ بۆ ؟! تاکوێ ؟.. و چەندین پرسیاری تری لەم چەشنە کە خولیای مێشکی گشت زانا و هۆشمەندێک ، ئا لەم کاتەدا و لەم حەپەساوی سەرسوڕماوی یەدا ، ئایین سەری پیرۆزی بلند دەکاتەوە ، لێمان دێتە پێشەوە ، دەچریکێنێ بەگوێماندا ، دەچرپێنێ بە دڵماندا و دەڵێ : زانست ، ئیتر بەسە ، لێرەدا بوەستە ، نۆرەی مە ، بواری منە ، هونەرمەند بناسێنم ، تۆ هونەرەکە دەناسێنیت منیش هونەرمەند ، دەزانن بۆ ؟ چونکە زانست پێ ویستی بە چەند پێشەکیە- کی ڕاستە تا بگات بە ئەنجامی

راست ، ئه و بیشه کیانه ش له ده ره وه ی هونه ره که ده ست ناکه وێ هونه رمه ندیش له ده روو له سه ری هونه ره وه یه له به ر ئه وه یه زانست له ناسینی هونه رمه نده که دا کۆڵه وار ده وه ستێت ، جا بۆیه ناساندنی هونه رمه ند ئه رکی ئایینه ، ئیتر لێره وه زانست و ئایین شان به شانی یه کێ ئه م هونه رو ئه و هونه رمه ند ئاشکرا ده که ن ، تا بوونه وه رمابێ ئه م ره وته هه رده بێ.

هه رچه نده ئایین له رێگه ی قورئانه ـ که یه وه ئاماژه بۆ هه ندێک یاسای بوونه وه ر ده کات ، پاشان ئه رکی سه رشانی زانسته پیشه کی و هه نگاوه کانی گه یشتن به م ئه نجامه ئاشکرا بکات ، زانست له م بوونه وه ره ی که توانستی په روه ردگار دروست بووه ده کۆڵێته وه ، ئایینیش په روه ردگار ده ناسێنێ ، کاتێک زانست ئه وه ده سه لمێنێ هیچ دروست کراوێک بێ کار نی یه ، ئاینیش ئه وه ده سه ـ لمێنێ که مرۆڤیش بێ هوده دروست نه کراوه ، کاتێ زانست له جه سته ده کۆڵێته وه ، ئاینیش له که ڵ میوانی ناو جه سته واته رۆحی دا!

ده دوێ ، بۆ نموونه کاتێ زانست چاو توێکاری ده کات و لێی ده توێژێته وه ئایین ئاراسته ی ئه و چاوه ده کات له چی دا به کاری بهێنێت . ..

ئا به م چه شنه ئایین و زانست پێکه وه سیفه تی هه ره مه زنی مرۆڤ پێک دێنن له گشت گیاندارو زینده وه رێکی تری جیا ده که نه وه ، گرنگی مرۆڤ له وه دایه هه ر ئه وه له م پێشانگا مه زنه دا خاوه نی عه قڵ و هۆشه له م پێشانگایه تێ ده گا و لێی وورد ده بێته وه ، هه ر ئه مه ش تاقه ئامانجی سه ره کی دروست بوونی مرۆڤه که له جوانی و قه شه نگی پێشانگای بوونه وه ر و ناساندنی خاوه نه که ی وورد بێته وه ، ناچاری ده کات سوجده ی شوکر بۆ ئه م هونه رمه نده مه زنه به رێت که تاقه پێشانگایه مرۆڤ خۆیشی تێیدا تابلۆیه کی مه زن و قه شه نگ بێت جا که ئه م بوونه وه ره مه زنه ته مه ن درێژه له پێناوی مرۆڤدا دروست کرا بێت ، ئه ی بۆچی ده بێت ته مه نی مرۆڤ هێنده که م بێت ..

ته مه نیکی ٦٠ ساڵ له کوێ که مرۆڤ به سه ری ده بات و ، ته مه نی

بوونەوەر لە کوێ نزیکەی ١٥ ـ ٢٠ ملیار ساڵە هەیە و خواش دەزانێ تاکەی دەمێنێ ، واتە ئەگەر ئامانجی دروست بوونی مرۆڤ هەر دیتنی ئەم پێشانگایە بێت ، ژیان بێبایەخە ، تاڵە ، کەمە ، کورتە ، تاریکە ، ئازارە ، ئەشکەنجەیە و چەندین تاڵاوی تر بەشمان دەبێت ، گەر چاوەڕوانی ژیانێکی تر لە شێوە و فۆرمێکی تر نەبین .

oooooooooooooooooooooooooo
xxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxx
oooooooooooooooooooooooooo

سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە :

(١) " العلم فی منظوره الجدید "
روبرت م. اگروس
جورج ن. ستانسیو
وەرگێرانی : د. کمال خلایلی .
(٢) " الدین و العلوم الطبیعیة "
و " العلم الحدیث فی نظر الاستاذ سعید النورسی "
لە بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی (یەنی ئاسیا) لە تورکیا .

---

**لاوێکی ئەمریکیی موسڵمان بنکەیەکی کۆمپیوتەریی ئیسلامی دروست دەکات ..**

لاوێکی (١٨) ساڵی ئەمریکیی موسڵمان بەناوی (محمد خان) بنکەیەکی بۆ زانیارییە ئیسلامییەکان دروست کرد کە تا ئێستا وێنەی نییە .. ئەم لاوە کە دەرچووی بەشی ئەندازیاریی کۆمپیوتەری پەیمانگای تەکنۆلۆجیی شیکاگۆیە ، دەڵێ: هەست دەکەم کە موسڵمانان پێویستیان بە بنکەیەکی زانیاریی هەیە . بۆیە هەر کەسێک دەتوانێت پەیوەندیی بەم بنکەیەوە بکات لە رێی بنکەی (ئنتەرنات)ی جیهانییەوە کە (١٤) ملیۆن کەس لە (١٣٠) وڵاتی جیهاندا تیایدا بەشدارن ..

بنکەکەی لاوی ناوبراو تایبەتە بە زانستە جۆراوجۆرە ئیسلامییەکان بە زمانی ئینگلیزی ..

شایانی باسە ناوبراو بەتەمایە بەرنامەیەکی پێشکەوتووی کۆمپیوتەری بە زمانی عەرەبی پێشکەش بە بەردەستی زانایان بکات ..

گۆڤاری (العالم)
٥.٣ / ١٩٩٣

یاریده دەری پزیشک
هیوا امین محمد

پیاز بە کۆنترین ڕووەکێ دەژمێرێت لە جیهاندا کە لە لایەن مرۆڤەوە زانرابێت .. ئەو ڕووەکە بووە کە هەمیشە وەکێ خواردن و وەکێ دەرمان لە هەموو جیهاندا و لە هەموو قۆناغە کانی مێژووی مرۆڤایە تیدا بەکارهێنراوە ..
نووژداریێتیی نوێش دانی نا بە ڕاستیی ئەو بیرو بۆچوونانەی کە نووژدارە کۆنەکان دەربارەی پیاز نووسیویانە .. بەڵکو بە مەش نەوەستان و ئەوهەموو سوود و خاسیە تانەیان دەست نیشان کرد کە نووژدارەکانی قۆناغەکانی ڕابردوو بۆی نەچووبوون و پەیان پێ نە بردبوو ..

ئەوەتا توێژەری ڕووسی ( پ . تۆکین ) چەند توێژینەوەو لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی لەسەر ( ١٥٠ ) جۆر ڕووەکی لەناوبەری میکرۆبەکانی کرد ، بۆی دەرکەوت کە پیاز پێشرەو سەرقافڵەی هەموو ڕووەکەکانی ترە لە کوشتن و لە ناوبردنی میکرۆبەکان بە تایبەتی تیفۆئید واتە گرانەتا ، بەڵکو چەند قاتیش لەسەرووی ئەوانەوە ..
( دکتۆر ڤیلا نۆڤا ) و ( دکتۆر تۆدریستیف ) لە زانکۆی ( تۆمسکی ) ی ڕوسیا بە تاقیکردنەوە سەلماندیان کە ئەو هەڵمە تیژەی کە لە پیازەوە دەردەچێت و بەرزدەبێتەوە توانایەکی بە هێزی هەیە بۆ کوشتن و لە ناوبردنی بەکتریا زیانبەخشەکان.
هەروەها چەند توێژەرێکی تر

لەبنکەی تاقیگاکانی ویلایەتی (مشیگان) ی ئەمریکی سەلماندیان زیادکردنی ڕێژەی گوشراویی پیاز پێویستە بۆئە و دەرمانانەی کە بۆ لەناوبردن و قەلاچۆکردنی ڕووەکە مشەخۆرەکان بەکاردەهێنرێت ..

پیاز خواردنێکی دەوڵەمەندە بەماددەکانی (کلس و ئاسن و گۆگردو ڤیتامین (A) و (C) و نەیاسین ـ پرۆتین .. هەروەها کە مێکێ لە ماددەی کاربۆهیدرەیتی تێدایە ..

ئەو بۆنە تیژەی کە لە پیاز بەرزدەبێتەوە بریتییە لەزەیتێکی هەڵچوو کە پێیدەڵێن (یەک ـ ئۆکسید) بەهۆی پاکێ کردن و ورد کردنی پیاز ئەو ماددەیە دەردەچێت و لەهەوادا بەرز دەبێتەوە ، بێ ئەوەی ببینرێت .. کاتێ دەگاتە چاو ئەو ماددە کیمیاییـ ـیە لە هەندێ ئاوی ناو چاودا دەتوێتەوە و، دەبێتە هۆی دروست ـ کردنی ترشە لۆکی (کبریتیکێ) ئەو ترشە لۆکەش ماددەیەکی ورووژێنەرە و دەبێتە هۆی فرمێسکێ دەردانی چاو ..

**سوودەکانی پیاز لەبواری چارەسەری و بەرگری دا :**

(١) پیاز یارمەتیی بەهێزبوونی سووڕی خوێن دەدات .. ئەویش بەهۆی بوونی ماددەی کالیسیۆم و ڤیتامین (A) .. ئەم دوو ماددەیە بەگونجان لەگەڵ یەکتری دەبنە هۆی توانەوەی ئەو چەوری یەی کە بە دیوی ناوەوەی بۆری خوێنبەرە ـ ـکانەوە نیشتووە .. لەئەنجامدا دەبێتە هۆی پاکێ کردنەوە و فراوان بوونی بۆری یە خوێنبەرەکان و لە کۆتاییدا فیچقە کردنی خوێن بە شێوەیەکی بەهێزتر .. ئەمەش دەبێتە هۆی بەهێزبوونی سووڕی خوێن و دابەشکردنی خوێن بە شێوەیەکی پاراوتر بەسەر هەموو ئەندامەکانی لەشدا ..

کاتێ مرۆڤ پیاز لەگەڵ خواردندا دەخوات ، ئەو خۆراکە دەتوانێت هێرش بەرێتە سەر بارستە کۆلیسترۆڵەکان و بەهۆی ئەو زەیتەی لەناو خواردنەکەدا هەیە ، ئەو بارستە کۆلیسترۆلانە ورد ورد بکات و بیانتوێنێتەوەو ، لەئەنجامدا مرۆڤ لەدەستی ڕزگاری دەبێت .

دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەو ماددە کاریگەرەی کە لە پیازدا هەیە نە بە پلەی گەرمای بەرز لە ناو دەچێت ، وە نە لە ئاویشدا دەتوێتەوە .. بۆیە دەتوانین پیاز بخۆین چ بە کاڵی بێت وە چ بە کوڵاوی بێت .. بەڵام باشتر وایە بە زۆری بە کاڵی بیخۆین چونکە هەندێ ماددەی تیایە کە گەرمی کاری تێدەکات ، وەک هەڵاتەکانی ( خمائر ) ی ( ئۆکسیداز و دیاستاز ) ..

توێژەرەکان سەلماندوویانە کە پیاز پێشەنگی هەموو رووەکە دەرمانی یەکانە .. خواردنی پیاز بە کاڵی دەبێتە هۆی چارەسەر کردنی بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن ... ئەم توێژەرانە دەڵێن پیاز ماددەی ( پرۆستاگلاندین ) ی تێدایە بە رێژەی چارەکە گرامێک لە هەر سەلکە پیازێکدا .. ئەم ماددەیەش نیمچە هۆرمۆنی یەو ، تاکو ئێستا لە هیچ رووەکێکی تردا نەدۆزراوەتەوە . ئەمەش بە تاقیکردنەوە سەلمێنراوە کە زانایان لە سەر مشک کردوویانە بە دەرزیی یەک گرام ماددەی ( پرۆستا گلاندین A ) ، واتە ئەوەندەی کە لە چوار سەلکە پیازدا هەیە ..

ئەم گرامە لە م ماددەیە - پاش ئەوەی لە مشکەکەیان دا - بووبە هۆی نزم بوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێنی ئەو مشکە بە رێژەیەکی زۆر .. جا لە بەرئەوەی دینامیکی یەتی سووڕی خوێن لە مشک و ئادەمیزاددا لە یەک دەچن ، بۆیە زانا و توێژەرەکان رایان وایە کە هەمان کاریگەریی بۆ سەر سووڕی خوێنی مرۆڤیش هەیە.

(۲) پیاز سوودبەخشە بۆ نەخۆشی یەکانی جگەر ، ئاوبەندی و ئەستووربوونی لولاکێ و، ئاوسانی سکێ و هەندێ لە نەخۆشی یەکانی دڵ و زۆر مـیز کـردن ..

ئەمەش بە هۆی بوونی هەڵاتەکانی ( ئۆکسیداز و دیاکتاز ) .. بەڵام ئەم هەڵاتانە بە کارتێکردنی گەرمی کەم دەکەن و دەپووکێنەوە ، بۆیە پێویستە پیاز بە کاڵی زیاتر بخورێت نەک بە کوڵاوی یا سوورەوەکراوی ..

(۳) هەروەک سەلمێنراوە کە پوختەی پیازی کاڵ کارلێکێکی کوشندەیە بۆ ئەو میکرۆبانەی کە لە ناو دەم و ریخۆڵەکاندا نیشتەجێن،

هه روه ها سوودی هه یه بۆ ئه‌و که سانه ی تووشی نه خۆشیی موولووله کانی دڵ بوون .

(٤) له به ر ئه وه ی پیاز مادده ی نیشاسته ی تێدا نی یه، ئه‌و که سانه ی تووشی نه خۆشیی شه کره بوون ده توانن به بێ ترس بیخۆن .. به ڵکو بوونی مادده ی (کلوکۆنین- Klukonin ) له پیازدا زۆر سوود- به خشه بۆ تووش بوو به نه خۆشیی شه کره، چونکه یارمه تیی هاوتا کردن و ده ست نیشان کردنی ڕێژه ی شه کر ده دات له خوێندا .

هه روه ها (ئه نسولین) جۆره هۆرمۆنێکه، له (په نکریاس) ه وه ده ڕژێته ناو ڕیخۆڵه ی دوانزه گرێ بۆ یارمه تی دانی سووتانی شه کری گلوکۆز و گۆڕینی بۆ دووه م ئۆکسیدی کاربۆن و هه ڵمی ئاو و وزه ی گه رمی، بۆیه نوژداران ئه نسولین وه ک ده رمانێک و چاره سه رێک له دژی نه خۆشیی شه کر ده ده ن به‌و نه خۆشانه ی که تووشی شه کربوون .. به ڵام مرۆڤ پێش ئه وه ی پێویستی به به کارهێنانی داوده رمان و ڕاکردنه لای نوژدار ببێت، ده توانێت ڕێژه یه کی ته واو ڕۆژانه پیاز له گه ڵ خواردنندا بخوات بۆ هاوتا کردنی ڕێژه ی شه کر له خوێنه که یدا .

(٥) هه روه ک له ناو کورده واریی خۆماندا پیاز ده پیشێندرێت و بۆ چاره سه رکردن و سووک کردنی باری هه ڵامه ت (په ...یو ، زکام ) به کار- ده هێنرێت ..

(٦) پیاز بۆ کوشتن و وه ده رنانی کرمی ڕیخۆڵه و هه موو ئه و مشه- خۆرانه ی له ناو ده م و ڕیخۆڵه کاندا ده ژین به کار ده هێنرێت ..

(٧) پیاز بۆ کۆکه و به ره هه نگ واته (الربو asthma) به کارده برێت.

(٨) پیاز توانای چاک کردنه وه- یه کی به رزی هه یه بۆ ئه‌وکه سانه ی تووشی نه خۆشیی پرۆستاتی توند بوون. هه روه ها خوار..نی پیاز به کاڵی سوودێکی زۆری هه یه بۆ ئه‌و که سا..ه ی که تووشی نه خۆشیی میزه چرکێ بوون ..

(٩) هه روه ها پیازی پیشاو بۆ ده م پێ که رێی و گه یاندنی دومه ڵ و سووره کوان و قینچکه کان به کار- ده هێنرێت ..

تێبینی : ئه وه ی جێی داخه

ئه وه یه که خه لکێ له خواردنی پیاز ـ به تایبه ت به کالی ـ دوور ده که ونه وه و ، هه میشه خۆیان دووره په رێز ده گرن لێی .. ئه ویش له به ر ئه و بۆنه ناخۆشه یه تی که له ده می ئه و که سه وه ده رده چێت که خوارد بێتی، به لام زانست له و بواره دا ده سته و ئه ژنۆ دانه نیشتووه به لکو چاره سه رێ یه کی بۆ ئه م کێشه یه دۆزیوه ته وه .. ئه ویش به دروست کردنی ده رمانێکێ له پوخته ی پیاز و ئه و ماددانه ی که له پیازدا هه ن ، که هه م پله ی خۆراکی و هه م پله ی ده رمانه که شی پاراستووه .. ئه م ده رمانه به رادە ی نیو که وچکی چێشت ده کرێته نیو پەرداخ ئاوی شیرین ، واته نیو په رداخ ئاوه که ئه کری تێ ده کرێت له پێش خواردن ده خورێت ، جارێکی تریش پێش نووستن .

ڕێگایه کی تریش هه یه بۆ ڕزگار بوون له بۆنی پیاز و سیر، ئه ویش به خواردنی سه وزه کان به تایبه ت که ره وز و ته ره تیزه و که وه ر .. ئه ویش ده گه ڕێته وه بۆ ئه و ماددە کلۆرۆفیله ی که بۆنی پیاز و سیر هه لده مژێت ..

---

xxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxx

سه رچاوه کان :


١) د . صبری القبانی ، الغذاء لا الدواء

٢) د . هیوا عمر احمد ، ده رمانگه ی کوردی ١٩٨٧

٣) وزارة الزراعة و الاصلاح الزراعي ـ مديرية الارشاد الزراعي ، ارشادات زراعة البصل ١٩٧٥

٤) مجلة ( طبيبك ) ـ العدد(٢٧١)/ آب ١٩٨٠

٥) مجلة طبيبك ـ العدد (٢٨٠) / آيار ١٩٨١

٦) مجلة طبيبك ـ العدد (٢٧٥) / كانون الاول ١٩٨١

٧) د . فاضل مصلح حمادي الحمدي و بطرس كوركيس يوحنا ، محاصيل الخضر للصف الثاني الزراعي .

دکتۆر کۆسار هەڵەبجەیی

کۆکە ڕەشە یەکێکە لە نەخۆشیەباوەکانی ناو منداڵان، بە تایبەتی ئەوانەی کە بە منداڵی ناکوترێن دژی ئەم نەخۆشی یە..
ئەم نەخۆشی یە پەتایە بەهۆی جۆرە زیندەوەرێکەوە تووشی ئەبێت پێی دەڵێن: ((Bordetella Pertussis)) بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشی یە لە ئەنجامی گەردیلەی ئاو یان هەوا کە زیندەوەرەکەی تێدایە لە دەم یان لووتی نەخۆشەکە دەگوێزێتەوە..

ئەم نەخۆشی یە لەم ساڵانەی دواییدا زۆر کەمی کرد بەهۆی کوتانەوە، کە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا.. بەڵام هەروەکو لەسەرەوە باس کرا ئەگەر هاتو منداڵەکە نەکوترا ئەوا تووش دەبێت بەتایبەتی لە پێش دوو ساڵیدا، وە ئەگەر چارە نەکرا، ئەوا (٪١٠) یان بەرەو مردن دەڕۆن..

هه روه ها مرزڤی گه وره ش تووشی ئه م نه خۆشه ده بێت ، به لام به شێوه یه کی سووکتر .

ماوه ی پێگ یشتن نزیکه ی (٧-١٧) ڕۆژه .

**نیشانه کانی :Signs & Symptoms**

بریتی یه له ( ٣) قۆناغ .

**١- قۆناغی یه که م :** سه ره تایی نه خۆشیه که ئه م نیشانانه ی لای خواره وه ی هه یه :

ئاوی چاو و لوتی به رده بێت ، پژمین ، هیچی پێ ناخورێت ، پاشان کۆ که ده ست پێ ده کات که له سه ره تادا له شه ودا هه یه پاشا به یانیانیش ده ست پێ ده کات .

**٢- قۆناغی دووه م :** له م قۆناغه دا نه خۆشه کهئه م نیشانانه ی هه یه : کۆکه یه کی کتو پڕی یه کێ له دوای یه کێ که (٥-١٥) دانه یه پاشان دوای ئه وه هه ناسه یه کی خێرای قوول هه ڵده کێشێت چونکه له ماوه ی کۆکه دا توانای هه ناسه دانی نی یه ئه م نیشانه یه له ماوه ی (٢٤) کاژێردا نزیکه ی (٥٠) جار دووباره ئه بێته وه هه ندێ جار ڕشانه وه ی له گه ڵدایه . ترس و ماندوبوون و پژمین و هه ڵمژینی ـ تۆزو خۆڵ ئه بێته هۆی دروست بوونی ئه م کۆکه یه .

**٣- قۆناغی سێ یه م :** هه روه ها پێ ی ده ڵێن قۆناغی چاکبوونه وه . له م قۆناغه دا نه خۆشه که به ره و چاکبوونه وه ئه ڕوات و توندو تیژی کۆکه ی نامێنێت ، ئه م قۆناغه (٤) هه فته دوای سه ره تای ده ست پێ کردنی نه خۆشیه که ڕوو ئه دات .

**ماکه کان Complications**

١-خنکاندن به تایبه تی له منداڵدا .

٢- زیاد بوونی په ستانی ناو مێشک ( که لله ی سه ر ) ئه میش له کاتی کۆکه کتوپڕه که دا ، که له وانه یه ببێته هۆی تێکشکاندن و مردنی خانه کانی مێشک له ئه نجامی پچرانی بۆریه کانی خوێنی مێشک .

٣- زیاد بوونی په ستانی ناو سنگ به هۆی پڕبوونی سنگ له هه وا و تێکشکاندنی په رده ی سی .

**چاره سه رکردن Treatment**

١- چاودێری ته واو ی منداڵه که بکرێت به تایبه تی له کاتی کۆکه کتو پڕه که دا چونکه له وانه یه ببێته هۆی خنکاندنی

٢- خواردنی چاک پێویسته بدرێته نه خۆشه که به تایبه تی ئه گه ر ڕزند

ڕشـایـه وه .
٣ـ به کارهێنانی که پسولـــــی ئیری ثرۆمایسین Erythromycin (٥٠ مغگم /کگم) بۆ ماوەی (١٠) ڕۆژ
٤ـ کۆرتیکۆستروید Corticosteroids بۆ ماوه ی (٤-٦) ڕۆژ بۆ کـــه م کردنه وه ی تو ندو تیژی کۆکه که .

**قـه لاچـۆ کردن :**

کوتان دژی ئه م نه خۆشیه له منداڵدا که کوتانی سیانی پێ‌ده ڵێـن دژی وه ناق و ده رده کۆپان و کۆکه ڕه شه. (Diphtheria ,Tetanus, Perthussis )

oooooooooooooooooooooooo

**سـه رچـاوه‌کان :**


1. Current Medical Diagnosis and treatment .
2. David Son's Principles of Practice of Medicine .


**ئایاده‌زانیت که جگه‌ره سه ره‌ڕای ئه‌و زیانه گه وره به ی له لایه نی ئابووری‌یه‌وه هه یه تی - به تایبه تی له م ڕۆژانـــه دا - ئه م زیانانـــه ی خواره وه ی هه یه :**

١) تـــه نگه نه فه سی ..
٢) بانی هه رس نه کردن
٣) له بیرچوونه‌وه
٤) لاوازی ( جنـــسی )
٥) هه وکردنی بۆرییه بخوله کان
٦) سه ر ئێـشه
٧) دڵ دانه مه زراوی ، یا دڵه ڕاوکێ ..
٨) سیلـی‌سی‌یه کان ..
٩) ئازاری ده ماغ ..
١٠) ڕشانه وه ..
١١) لیکـــی زۆر ..
١٢) زیان گه یاندن به ده مودان
١٣) هه وکرد نی دوولـێـوه ..
١٤) هه وکردنی قورگ ..
١٥) تووش بوون به (شه له ل )..
١٦) لاوازیی کـشتـی ..
١٧) خوێن به ربوون ..
١٨) تـووش بـوون به ( سه ره طان ) ..
١٩) کـزیی چــاو ..
٢٠) خه و زڕان ..
٢١) نه خۆشیی دڵ و بۆریی خوێنه کان ..

به ڕێـزان !

ئه گه ر سه رنجی ته واوی ئه و گۆڤاره گشتی یانه ی دنیای ڕۆژنامه گه ریی ئه مڕۆ بده ن ، چ ئه و گۆڤارانه ی که له لایه ن ده سته و تاقمی سه ربه ست و بێ لایه نه وه ده رده چن یان ئه وانه ی ئۆرگانـی ڕاگه یاندنی لایه کێ بـن ، ئه م دوو خاڵه تێبینی ده کـه ن :

(١) به ده رچوونی چه ند ژماره یه کێ و به سه رچوونی ماوه یه کێ ، ئه و سا ورده ورده بۆچوون و هه ڵوێستی ئاشکرا ده کات که ده یه وێت خزمه تـی چ مه به ست و ئامانج و ئایدۆلۆژی یه کێ بکات و ، چی بڵێ و چـی بگه یه نیت و خوێنه رانی به ره و چ جۆره هه ڵوێست گرتنێـکێ ئاراسـته بـکات ..

(٢) هه ر له ژماره کانی سه ره تاوه هه وڵی ئه وه ده دات که سوود لـه کۆمه ڵی نووسه ری ناودار و خاوه ن قه ڵه می به توانا و لێهاتوو وەرده گرێت تا به هۆیانه وه هه رچی زووتر خۆی له دڵی خوێنه راندا جێگه بکاتـه وه و به شێکی زۆرتر له خوێنه ران بۆ خۆی دابرێت ..

لێره وه ئه گه رچی سه رنجی گۆڤاری (په یامی ڕاستی) له ڕووی ئـه م دوو خاڵه وه بـده ین ، ئه وا ئه م گۆڤاره هه ر له سه ره تاوه بێ سێ و دوو لێ کردن و به ڕاشکاوی جاڕی ئه وه ی داوه که مولته زیمه به په یامـی ئیسلامه وه ، وه له و ڕوانگه یه وه هه ڵوێست گیریی ده کات ..

دووه م خاڵ ئه وه یه که گۆڤاری په یام هه ر له سه ره تاوه خۆی وه قفی تازه پێگه یشتوو و لاوان و نووسه رانی نوێ کردووه و ، سڵی له بڵاوکردنه وه ی ئه و نووسینانه نه کردووه که زۆرجار له چه ند ڕووی هونه ری و بابه تی یه وه لاواز بوون به هیوای ئه وه ی پاوه نی قه ڵه م ڕاهێنان و پێگه یاندنی کۆمه ڵێک نووسه ری ئیسلامیی ڕه سه ن بێت له کوردستاندا ، بۆیه حه ز ده که ین پێتان ڕابگه یه نین که :

(١) هیچ نامه یه کتان پشت گوێ ناخرێ به مه رجی گه یشتنی به نووسینگه که مان ..

(٢) مه رجه کانی نووسین و بابه تیه ت له نووسیندا زیاتر په یره و بکه ن .. ( نووسین زانسته و ، مه رجه کانی ڕه چاو بکه ن ) ..

(٣) ئه مه فرسه تێکی باشه بۆ به رزکردنه وه ی توانای نووسینتان و به نامه یه ک و دوو نامه و سێ نامه کۆڵ مه ده ن و به رده وام بن ..

ئه وا له برگه ی ده ی سێهه م داین .. هیوادارین هاوکاریتان هه رچی زورتر و زیاتر بیت به ره و نووسینی به پێز و زانستی یانه ..

فه رموون ئێسته ش له گه ڵ به شێک له وه ڵامی به ره مه کانتان:

به ڕێز کاک هیوا فاتح !
هیوادارین له مه ودوا وشه ی
گیرخواردووی هه گبه که ت ئازاد
بێت و له شه قه ی باڵ بدات ..
ئه مه ش کۆپله یه ک له شیعره که ت
له گه ڵ ڕێزماندا :
با په نجه کان
بئاخنه گوێیانه وه ..
خۆیان که ڕ که ن
خۆیان کوێر که ن ..

ئه م داستانه ده گێرمه وه ..
به هه نگاوی نه براوه
هێز و توانای ئه م باوه ڕه
ده ڕوا! .. ده ڕوا
نه کشاوه به ره و دواوه !

* خاوه نی هۆنراوه ی ( ڕێگا )
کاک محمد حسین چیا !
ده ست و خامه که ت خۆش بیت ،
به لام هیوادارین زیاتر ده رباره ی
کێش و مۆسیقای شیعری

بخوێنیته وه .. ئه مه ش كۆپله یه كێ
له شیعره كه ت :
منیش ئه مرۆ بڕیار ئه ده م
وه كێ مرۆڤیكی به خه به ر
له ناو هه زاران ڕێگادا
ڕێگاكه ی خوا بگرمه به ر .
* به ڕێزان : محمد احمد محمود ،
ئه مال نجم الدین ، خوشكه لاو لاو
حسین ! سوپاسی هاوكاریتان
ده كه ین له سه ر بابه ته زانستی -
- یه كانتان ، له به ر بلاوبوونه وه ی
هه ندێكیان و لاوازیی هه ندێكی
تریان نه مانتوانی بلاویان بكه ینه وه،
چاوه ڕوانی به رهه می به هێزترتانین .
* (قۆناغه كانی دابه زینی قورئان )
به شی یه كه می باسێكی به ڕێز باوكی
هیوایه .. هیواداریین هه موو
باسه كه ت له یه كێ به شدا كۆ-
بكه یته وه به شێوه یه كی چڕو پڕ و
كورتكراوه ، هه تا پشت به خوو !
بلاوی بكه ینه وه .. سوپاس بۆ
هاوكاریت ..
* به ڕێزان : طارق هه له دنی ،
حه مه عه لی ، ڕێبین احمد !
زۆر سوپاسی به شداربوونتان ده كه ین
چاوه ڕوانی به رهه می تازه و
به پێزترین ..
* به ڕێز كاكێ رانیار خورمالی !
سوپاسی هه ستی برایانه ت ده كه ین و
برایه كی دلسۆزی ئێمه یت .. داواكارین
كه زیاتر ده رباره ی شیعر و په خشان
نووسین بخوێنیته وه .. هه میشه
سه ركه وتوو بیت ..
* ( ڕاسته ئه لێن ) و (له م خاكه دا)،
دوو هۆنراوه ی به ڕێز كاكێ ابوبكر
علی یه ، هۆنراوه كان درێژن و
هه ندێ دووباره بوونه وه یان پێوه
دیاره .. هیواداریین چڕترو كورتتر
بنووسیت .. سوپاس بۆهاوكاریت.
* به ڕێز م. به یاد ! سوپاسی ئه و
ڕێزو سلاوه گه رمه ت ده كه ین كه
به رانبه ر گۆڤاره كه و كارگێڕانی
ده رت بڕیبوو.. هۆنراوه كه ت
موناجاتێكی پڕ سۆز و ئه وینه ..
هیواداریین به رده وام بیت .. ئه مه
كۆپله یه كه ده یكه ینه دیاریی
خوێنه ران :

ڕووی ده می لاله م له تۆس خوایه
كه تۆ مامه له ت له گه ل دلایه
ئێسته ش بۆ كرده ی به دی ڕابردووم
چلۆن په نجه كه ی نه دامه ت ئه جووم

برای بەڕێز کاکۆ لوقمان ڕەئــــوف قـادر ! زۆر سوپـاسی بەشداریـــت دەکەین .. بابەتەکەت (الادمان) لەبەرئەوەی نزیکەی نیـــــوەی عەرەبی بوو نەمانتوانی بــــلاوی بکەینەوە .. هیواداریـن بەرهەممـان لـێنەبـڕی .

* بـەڕێز شکری ئاکرەیـــــــــی ل ئـاکــرێ !

ئەم گەلەک سوپـاســـــــــی هاوکاری یا تـەدکەین .. ئەڤـــــە ئێکۆ کۆپـلە ژ شیعرا تــــــــــە (ڕووناهیـا ئیسلامـی) :

ئیسلام بۆ مە بیە :یـان
ئاشتی و خۆشی دا مە هەمیـــان
شوکر بـۆ خالـقی جیـهـانَ
ب ئیسلام ڕونکر خـر زینـدان .

* ڕابردووم پێناسـەم دەکات
من ئازار ڕێگەم پێ ناگرێ
ناسۆر و ئەشکەنجە و لێدان
تیاچوون و تاریکیی زینــدان
تیشکی خۆرم لـێ ون نـاکات
ڕێـی خەباتـم لێ نـاگـرێ ..

ئەمە کۆپلەیەکی شیعــریـی بەڕێز کاکۆ (پێشـرەو) ە .. هیواداریـن بەردەوام بیت لە خوێندنـــــــەوە و نـــووسیـــندا .

* بەڕێـز کاکۆ دڵشاد هەولێـــری و کاکۆ محمد احمد لەبـرایەتـی !

سوپاسـتان دەکەین و چاوەڕوانـــــی شیـعـر و هـۆنراوەی تازەتانـیـن .. سـەرکـــە وتـــووبـــن .

* بەڕێزان : غفار محمود محمد لە هەڵەبجەی شەهید ، هیـوا لە ڕانیە، ئازاد علی، برهان محمد ، عبد اللـــه عمر لە هەڵەبجەی تازە ، جمیــــــل قادر عبد الله لە هەڵەبجەی تـازە ، ا.ا.ع لە سید صادق ، کـــــــــاکۆ دەربــاز لە برایەتـــی !

برایانی دڵسۆز و بەوەفا ! زۆر سوپاسی نامە و پێشنیار و ئاگاداریە ـ ـکانتان دەکەین .. پشت بە خوا لــە داهاتوودا سوود و کەڵکیان لــێـــــــــــێ وەردەگریـن .. هیواداریـن پەیـــام بەگۆڤاری خۆنان بزانن، خـــــــوا سەرکەوتـوتـان بـکات .

* بەڕێز د. هەرەیدون عبد الستار! زۆر سوپاست دەکەین لــە سەر ئەو ئاگاداری کردنەوە و ڕەخنـــــــــــە زانستیەی کە دەربارەی (کەمخوێنی) ناردبــووت .. خوای گەورە نموونەتـان زۆر بـــکات .

خـواتـان لـەگـەڵ

# ڕۆژمێری مانگ

١١/١٠ کۆچی دوایی شاعیرو زانای کورد مه لا عبد الله محمد زێوه ر (١٩٤٨) .

— دیواری (به رلین) شکێنرا (١٩٨٩) .

١١/١١ کۆتایی جه نگی یه که می جیهانیی له نێوبه ر (١٩١٨) .

١١/١٢ کۆچی دوایی شاعیرو زانای کورد ماموٚستا (حه مدی) (١٩٣٦).

١١/١٤ داگیرکردنی شاری ئاکرێ له لایه ن ئینگلیزه وه (١٩١٩) .

١١/١٥ بلاّوبوونه وه ی ڕۆژنامه ی (ڕۆژی کوردستان) (١٩٢٢) .

١١/١٨ کۆچی دوایی شاعیری کورد (گۆران) (١٩٦٢) .

١١/٢٤ (بیلّ کلینتون) سه رۆکی ئه مریکا چاوی که وت به (سه لمان ڕوشدی) ... (١٩٩٣) .

١١/٢٤ عبد الله عزام و دووکوڕی له پیشاوه ری پاکستان شه هید کران (١٩٨٩) .

— کۆچی دوایی زانای کورد حه مدی به گی صاحبقران (١٩٦٠) .

١١/٢٩ دابه شکردنی فه له ستین (١٩٦٧) .

١١/٣٠ کۆچی دوایی شاعیری کورد (عه لی که مال باپیر) (١٩٧٦) .

داوای پاشکۆی (په یامی جگه رگۆشه کان) بکه له گه لّ گۆڤاره که دا..

# (پەیامی ڕاستی) رسالة الحق

مجلة ثقافية شهرية جامعة .. تصدر عـــن :

(( جمعية الكتّاب الاسلاميّين في كورد ستان ))

العـدد (٢١) / تشريـن الثانـي ١٩٩٣ / جماد الثاني ١٤١٤

# PAYAMI RASTEE
# (THE TRUE MESSAGE)

A MONTHLY CULTURAL GLOBAL MAGAZINE

ISSUED BY :

KURDISTAN ISLAMIC WRITERS ASSOCIATION

( K.I.W.A.)

NO.21 - NOVEMBER 1993 - JAMAD U THANI 1414

نرخـی (٥) دیــــناره.